# نووسەری کورد


گۆڤاری

یەکێتی گشتی ئەدیبو نووسەرانی عیراق

نووسینگەی رۆشنبیری کوردییە

ژمارە (٤) خولی سێهەم مایس ١٩٨٦



سەر نووسەر

محەمەد بەدری

جێگری سەرنووسەر

نافع ئاکرەیی

دەستەی نووسەران

صلاح شوان

محمود زامدار

حسین احمد جاف

عبدالکریم فندی

محمد امین پێنجوینی



دەرهێنانی هونەری

عبدالقادر علي مردان

سەرپەرشتی چاپ

محمد زەهاوی

# سەروتار

## خوێنەری ئازیز

● بەدەرکردنی سێ ژمارە لە گۆڤارەکەمان ساڵی ١٩٨٥ مان بەسەربرد ، ئەو ساڵەی کە ساڵی سەرکەوتنە مەزنەکانی وڵاتەکەمان بوو دژ بە رژێمی فارسی رەگەز پەرست ، لەم ساڵە تازەیەشدا رەنگە هەندێ کەس بپرسێ بۆچی « نووسەری کورد » تائێستاکە دواکەوت ، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەتوانین بڵێین راستە ئەم ژمارەیە دواکەوت بەڵام ئێمە توانیمان ژمارەیەکی تایبەتی لە گۆڤارەکەمان بە زمانی عەرەبی دەربکەین بە بۆنەی بەستنی کۆنگرەی هەشدەیەمی یەکێتی گشتی ئەدیبان و نووسەرانی عەرەب و ژمارەیەکی زۆری لێ بڵاوبکەینەوە بەسەر ئەو برا ئەدیبانەوە ..

● شتی دووەمیش کە پووی دا گرتنی دوەم کۆنگرەی یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی عیراق بوو ، لەم کۆنگرەیەدا زیاتر لە نەوەد ئەدیب و نووسەری کوردی بەشداری کرد ، هەر لەم کۆنگرەیەشدا بریاری ئەوە درا کە سەرەکی یەکێتی و ئەدیبانی کورد ببێتە جێگری یەکەمی ئەمینداری گشتی ئەدیبانی عیراق و ئەدیبانی کورد خۆیان حەوت نوێنەرەکەیان هەڵبژێرن بۆ ئەنجومەنی مەرکەزی و دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی ئەدیبان و

نووسەرانی کورد لە ناوچەی کوردستاندا هەمان دەسەلاتی مەکتەبی تەنفیزیان هەبێ ... بەم جۆرە داواکانی کۆبونەوەکەی هەولێر بەگشتیو زیاتر جێ بەجێ کران .

● ئەمە بەراستی شتێکی زۆر گەورەو مەزن بوو بەتایبەتی لەم کاتەدا ، کە ولاتە خۆشەویستەکەمان تووشی هێرشێکی زۆر دڕندانە بووە لەلایەن ڕیژێمی ڕەگەز پەرستی فارسەوە ، ئەدەبەکەمان وا پەرەبسێنێو ئەدیبان بتوانن بەو پەڕی سەربەستی یەوە کۆنگرە بگرنو نوێنەرەی خۆیان هەلبژێرن ... ئیتر هەر بژی وشەی ڕەسەنو بەشەرەف ... هەر شەکاوە بێ ئالای عیراقی سەرکەوتوو بە سەرۆکایەتی سەرۆکی سەرکەوتوو تێکۆشەر صدام حسین ...
نەمری بۆ شەهیدان عیراق .
مردنو سەرشۆڕی بۆ ڕژێمی خومەینیو دوژمنانی عیراقی خۆشەویستمان ...

— نووسەری کورد —

# کوردستان لە تورکیا

لە ئامادە کردنی
د. ئەحمەد عوسمان بەکر
١٩٨٥/٩/١

## تێ بینیەکی گشتی[1] وولاتو هاونیشتمانان

کوردستانی تورکیا فرەوانترین بەشەکانی وولاتی کوردە، وەگەورەترین بەش لە گەلی کوردی لێ نیشتە جێبوە.

ئەم بەشە بریتیە لە ٢٣٠ر٠٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشە کە (٣٠٪ تورکیا دەگرێتەوە)، وە (١٨) پارێزگا لە تورکیادا کوردیە، واتە: (ئەدیامان، ئاگری، بینگۆل، بدلیس، دیاربەکر، ئەلعەزیز، ئەرزنجان، ئەرزەروم، غازی عانتاب، حەکاری، قارس، مەلاتیا، موش، ماردین، سعرت، تونجیلی، ئورفە، فان).

بەپێی سەرژمێری دووایی لە ساڵی (١٩٧٠)دا، ژمارەی دانیشتوانی کوردستان لە تورکیا گەیشتوە بە ٧ر٥٥٦٠٠٠ کەس، لەمانە ٦ر٢٠٠ر٠٠٠ کوردن واتە ٨٢٪؛ بەشەکەی تر بریتیە لە تورك (بەتایبەتی فەرمانبەر، سەرباز..) وعەرەب (لەماردین، سعرت، غازی عانتاب)و نزیکەی نۆ هەزار ئەرمەنی لە دیاربەکرو قارسدا دەژین.

زیاتر لەمە، لەسەرژمێری لە ترکیادا پێویستە ئەم راستیەش لەبەر چاوبێت کەوا ژمارەیێکی زۆر لە کورد بەکۆمەڵ لە چەند ناوچەی ئەنەدۆڵدا نیشتەجێ بووینە وەکو ناوچەی (جیهان بیلی، هەیامانا، کورتۆغە، توقات، سانگیری، هتد)، هەمیشە سەدەها هەزار کرێکاری کۆچ کردوی کورد لە شارە گەورەکانی تورکیادا جێ گیربونە؛ تەنیا لە ئەستانبولدا نیو ملیون کورد هەن. ئەم کۆمەڵگایەی کورد لە دەرەوەی کوردستان بەژمارە دوو ملیون تا دوو ملیونو نیو دەگرنەوە لە ساڵی ١٩٧٠دا..

بەکورتی لە تورکیادا ٥ر٨ ملیون کورد زمان لە ساڵی ناوبراودا هەبون کە ٢٣٪ سەرژمێری جەمهوریەتی تورکی دەگرنەوە.. بەڵکو ئەم ژماریەش تەواوو وورد نیە.. چەندەها سەرژمێر لە نێوان ٥ر٨ تا ١٢ ملیون کورد هەن. کاربەدەستانی تورك سورن لەسەر ئەوەی ژمارەی کورد کەم بکەنەوە؛ لە لایەکی تر بەشێك لە میللەت پەروەران ئەم ژمارەیە لە رادەی خۆی پتر لە قەڵەم دەدەن.

هەروەها پێویستە ئەوەش بوترێت کەوا سەبارەت بەو چەوساند نەوەو زۆر لێکردنە دروندانەی نیو سەدەییێك کە کورد دوچاری بوە لە تورکیای تازەدا بەشێك لە کورد بەدەگمەن خۆ بە کورد لەقەڵەم دەدەن، ئەمەش لە سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥دا روون بووەوە کە خۆم [واتە نوسەر] بەشداریم تێدا کردوە. وەختی پرسیار لە کوردێکی هەژارو بێ دەرامەت کرا، (ئایا زمانی زگاکت چیە ؟) ئەم کوردە کە ووشەیێك لەزمانی تورکی نازانێت، لەوەڵامدا دەڵێت «باشتر وایە زمانی تورکی بنوسێت، چونکە دەمەوێ لە گیروگرفت خۆم بپارێزم».

ژمارەی کورد بەردەوام بەرامبەر بە ژمارەی گشتێ لە پەرەسەندن دایە. لە ساڵی ١٩٤٥ تا ١٩٦٥ ئەندازەی زۆربوونی دانیشتوان لە کوردستان بە ٢٠٨٨٪ بەرامبەر بە ٢٠٦٥٪ لەگشت تورکیادا گەیشت...

لەگەڵ ئەوەش، کوردستان هیشتا زۆر دوورە لەوەی کە بە ناوچەی هەرە ئاوەدانی جیهاندا بژمێردرێت. لە ساڵی ١٩٧٠دا تەنیا ٣٣ کەس لە هەر کیلومەترێکی چوار گوشە، بەرامبەر بە ٤٣٠٩ کەس بۆ گشت ترکیا دەژیان.

ئەم نیشتمانیانە بە شێوەییکی درشت لەناوچەکەدا نیشتەجێن... لە لاییکی تردا پلەی ئەم ژمارەیە بەرزە لە ناوچە رۆژ ئاواییەکانی کوردو لە موعەددەلی تورکیا تێپەر دەکات.

کۆمەڵگای کوردی هێشتا دێهاتیەو لەسەرشێوەی کشتوکاڵدا ماوەتەوە. لەساڵی ١٩٦٥دا، تەنیا ٢٧٠٨٪ لە دانیشتوان لە ١٤٦ شاروچە (ئیلسە)ی

کوردی‌و ١٨ شار دەژیان. شەش لەم شارانە زیاتر لە ١٠٠٫٠٠٠ دانیشتوی هەیە، وەك (غازی عانتاب، دیار بەکر، ئەرزەروم، مەلاتیا، ئەلعەزیزو ئورفە)، بەشەکەی دیکە، واتە ٧٢٪ لە ١١٫١٢٠ گوندو ٩٧١٧ دێیی بچووك نیشتەجێ بوینە. لە ساڵی ١٩٦٥دا، هێشتا نزیکەی حەفتا تا هەشتا هەزار نیمچە کۆچەر هەبوون. ئیمڕۆ تەنیا ٣٠٫٠٠٠ کەس دەبن.

لەو ساڵانەی دواییەدا شار ئاوەدان کردنەوە بە خێرایی بەرەو پێش ئەروات. ئەمەش لە بەر دوو هۆی بەیێك بەستراوەن: زۆرتر بوونی ژمارەی لە دێ دەربەدەر کراوەکان‌و کۆچ کردنیان بۆ شارەکان لە ئەنجامی تراکتور و ماکینە بەکارهێنان لە کشتوکاڵ چێکردندا. بەڵام ئەم شارنشینە ڕێکوپێك نیە، وە سەرەنجام کێشەی زۆری لە دووایە لە رووی ئیش دۆزینەوەو خانوی گوزەرانی‌دا. شارە مەزنەکانی کورد ئیستایش بەخانوی تەنەکەو شرو شەق دەورە دراون.

## پەروەردەو رۆشنبیری

نەخوێندەواری لە کوردستانی تورکیادا تائێستایش داخێکی گەورەیە، وەپاش پەنجا ساڵ لەژێر رژێمی (دیمکراتی‌و عیلمانی - لاییك) دا ٧٥٪ لەخەڵکی ناوچەکە لە تەمەنی سەروی شەش ساڵیدا هێشتا نەخوێندەوارن. لە گشت تورکیادا نەخوێندەواری لە رادەی ٥١٪ دایە، وە لە نێو هاو وولاتیانی تورك تەنیا ٤١٪، واتە دووقات نەخوێندەواری لە ناوچە کوردیەکان لە ئەوانەی تورکیەکاندا زیاترە. تا وەکو ئیمرۆش زۆربەی گوندەکانی کورد قوتابخانەی سەرەتایی ی تێدا نیە. لە گوندی بە قوتابخانە تەنیا یەك مامۆستا بە تورکی ئەزمون بە پێنج پۆل دەڵێتەوە. هەمان نەبوونی مامۆستا لە قوتابخانە ناوەندیەکانی کوردی کە بەژمارە پەنجا دەبن بەدی دەکرێت.

پاش دەرچوون لەم قوتابخانانە، قوتابیانی کورد بۆ وەرگرتن لە دانیشگاکاندا پێویستە بەربەرەکانی لەگەڵ قوتابیانی بەشکۆی تورکی ئەستانبولو ئەزمیردا بکەن ! وە لەتاقی کردنەوەکاندا دەرباز بن. بۆیە ماوەی

سەرسورمان نیە کەوا ژمارەی قوتابیانی کورد لە دەزگاکانی فێرکردنی بەرز بێ ئەندازە کەم بن. لە ساڵی ١٩٧٥ لە تورکیادا کە ١٨ دانیشگاو ١٥٧ دەزگای بەرزی فێرکردنی تێدابو، تەنیا یەك دانیشگا لە کوردستان (لە ئەرزەروم) دا هەبو، وە یەك کۆلێجی پزیشکی (لە دیار بەکر) و چوار ئاموژگای ئەندازیاری‌و ماموستایان هەبون. تەنانەت لەم ئاموژگایانەشدا ژمارەی قوتابیانی کورد لە نیوە کەمترە. تورکی زمانی فێرکردنە؛ زمانی کوردی لە ساڵی ١٩٢٥وە قەدەغە کراوە. لە چاپ‌دانی پەرتوك‌و گۆڤار بە کوردی تائیمرۆش یاساغە. بەلام بە پێچەوانەی سیاسەتی زۆر لێ کردنو دامرکاندنەوە، چاپکراوەی سیاسی وئەدەبی نهێنی کوردی دەر دەچێت‌و بلاو دەبێتەوە... ئەمەش لە راستیدا جولانەوەیێکی نوییە؛ تا وەکو ئەم دەورانەدا رۆشنبیرانی کورد بەزمانی تورکی بیرو هەستی خۆیان دەردەبری، نوسەرو ئەدیبانی کورد زمانی تورکیان بەکار دەهینا نەك تەنیا بۆ ئەوەی نوسراوەکانیان بۆ چاپکردن بەرەسمی وەربگیرێن، بەڵکو هەمیشە لەبەر ئەوەی چونکە ئاگاداریان لە ئەدەبیاتی نەتەوەیی یاساغ کراو زۆر کەمە، بۆیە توانایان لە زمانی میللەتی خۆیان نزمە. بەلام ئەم رۆشنبیرانەی کورد لە راستیدا دەستیان هەیە لە پێش خستنی ئەدەبیاتی تورکی. گەورە ترین رۆمان نوسی تورك، یەشار کەمال، لە کتێبەکانی «ستون» و «مەمەد هەلویەکەم» کە هەر دوکیان بۆ ٢٠ زمانی تر وەرگێردراون، دەردەکەوێت، خۆی کوردێکە، هەر وەکو خۆی لە هەموو هەلێکدا ئەم راستیە دەردەبڕێت.

هەستیار جاهز صدقی تارانجی‌و ئەحمەد عارف، وە رابەری سینەمای بە ناوبانگ یەلماز گۆنای، هەمویان کوردن. بەشێك لە فلیمەکانی گۆنای ناوەرۆکی کوردیەو لە چوارچیوەی کوردستاندا گیراون. زۆر گۆرانی بێژی ناوداری تورکیا وەکو نەسیمی‌و روحی سوو رەحمی سالتوك هەر کوردن.

لەساڵی ١٩٦٥وە جۆرە گەرانەوەیەك بەرەو گیانی نەتەوایەتی بەدی دەکرێت. هەست بە پێویستی دەربرینی هەستی دەروون بە زمانی نەتەوە لەلایەن رۆشنبیرانی کورد لە پەرەسەندندایە. لەلایەکی ترەوە، نەخوێندارانی کورد تەنیا بەزمانی زگماك قسە دەکەن، وە زمانی تر نازانن. ئەم جۆرە نەتەوایەتیە کە تێکەلاوە بەهەستی جەماوەری بێ گومان بناغەیەك بۆبوژانەوەی روناکبیریو ئەدەبی کوردی دەچەسپێنن

نزیکەی هەمو کورد (واتە ٩٩٪) موسلمانن... زۆر گوند لە کوردستاندا مەکتەبی ئایینی تێدایە کە مندالان بە عەرەبی هەندی زانیاری سەرەتایی ئاین و قورئان فێر دەبن. هەندێ لە ماموستا ئایینیەکان (مەلا کان) هەمیشە قوتابیان

فێری ئەدەبی کلاسیکی کوردی دەکەن وەکو نوسینەکانی (ئەحمەدی خانی، مەلای جەزیری، باتێ، تەیران، بابا تاهیر، وە حاجی قادری کۆیی، هتد) ئەمەش بێ ئەوەی کاربەدەستان هەستی پێ بکەن. ئەم مەلایانە دەوری زۆریان لە هەستی گەل هەبو لە سالانی پەنجاو شێستەکانی ئەم جەرخەدا. بۆیە کار بەدەستان ئەمانەیان لابرد و لە جێگایاندا ئاییندارێ مەدەنی (سیویل) یان دامەزراندوە بۆ ئەوەی ئایدولوجیەتی رەسمی وە پێش بخەن...

## باری ئابوری و کومەلایەتی

کۆمەلگای کوردی هێشتا لە پلەی کشتوکال دایە. وە هەروەکو لە سەرەوەش ووترا ٧٢٪ لە کورد لە گوندو لەسایەی کشتوکالو مەرو مالاتەوە دەژین. پیشەسازی تەنیا بۆ ٠٥٪ بۆ خەلکی ئیش مسوگەر دەکات. بەشە گەورەکەی تر لە دانیشتوانی شار بە بازرگانی و خزمەتی مەدەنیو ووردە ئیش خەریکن.

مەرو مالات بەخێوکردنی ئاسایی بە شێکی گەورەیە لە کارو بەرێوە چوندا. بەراستی کوردستان سەرچاوەی گرنگیوشە وولاغو مەرو بزنو وولاغ بەخێو کردنە لە تورکیادا.

ئەو تەکنیكو ئامرازو ئامێری لە کشتوکال چی کردندا بەکار دەهینرێن کۆنن وە لەوانەی لە بەشەکانی تری تورکیادا بەکاردێن زۆر دوا کەوتوترن. کوردستان ٣٩٪ عارەبانەی تورکیا بکار دینێت بەرامبەر بە تەنیا ٣٪ ماکینەی کشتوکال چێ کردنی گشت وولات. بەلام لەو کاتەیەوە کە بەشێك لە خاوەن زەوی (ئاغا) کان بوون بەسەرمایە دار ئەم جۆرە ماکینانەش روویان کردووتە کوردستان. لە سالی ١٩٦٥ تاوەکو ١٩٦٧ دا ژمارەی تراکتور کە لە کوردستان لە کاردا بوون گەیشت بە ٤٦٪ زەوی و زاری کشتوکالی کوردی هەمیشە ناهەموار دابەش کراون.

نزیکەی یەك لە شەش خاوەن زەوییەکان سیٚ لە سەر چواری عەردیان بەدەستەوەیە، لە لاییکی تر ٣٨٪ لە دانیشتوانی دیهات بەتەواوی لە زەوی بیٚ بەشن. وورد بونەوە لە تۆمارەکانی عەرد لە تورکیادا بۆمان دەر دەخا کە ئەم ناهەمواریە لە پەرەسەندن دایە، لەوکاتەیەوە کە تورکیا یاسا قانونی سویسری لە سالی ١٩٢٦دا پەسند کردوە بەلام ئەم جیاوازیە لە نیٚو هەبوونو نەبوونی زەوی تائیمرۆش نەبوویتە هۆی ئەوەی تیٚك هەلچونو بەربەرەکانی فراوان لە نیٚو جەماوەری جوتیارانی هەژار (٨٣٪ لە دانیشتوانی دیهات) و خاوەن زەویە دەولەمەندەکانی کەلایەنی کار بەدەستانی رەسمی دەگرن روو بدات...
لەلایەکی تر دوور نیە ئەم بارە بەردەوام ئەبیٚت.

ئەگەرچی کشتوکالی کوردی کۆنە لە رووی تەکنیك و دابەش بوونی زەوی، بەلام لە روویەکی ترەوە ئەم کشتوکالە باش رووی لەجیهانی دەرەوە کردوە، وەتا رادەی زۆر تیٚکەل بەبازاری سەرمایەداری تورکیا بووە. بۆ ویٚنە لۆکەو چەوەندەری شەکر، وە توتن دەچیندریٚن و چیٚ دەکریٚن بۆ هەردوو بازاری تورکیاو هەندەران، وە ئەمان بەرەبەرە جیٚگای بەرهەمی خواردن دەگرنەوە... هەروەها چەند کار خانەییٚك هەن، وەکو شەکر پالاوتن لە (ئەلعەزیز، مەلاتیا) و کارخانەی چیمەنتۆ لە (قارس، ئەرزەروم) و توتن پاکردن لە (بدلیس، مەلاتیا) و کارخانەی چنین و هونینەوە لە (دیاربەکر)دا... بەشیٚك لە کارگرتەکان بۆ کان هەلکەندن لە لایەن حکومەتەوە بەکریٚ گیراون. ژیٚر خاکی کورد دەولەمەندە لە چەند جۆر کانیٚك وەکو فۆسفات، نیلە، سفر، ئاسن، کرۆم هەندیٚك نەوتیش هەیە. شارۆچەی (مەعدەن) لە نیٚو دیار بەکرو ئەلعەزیزدا بەدەولەمەندترین سەرچاوەی کرۆمە لە جهاندا. لە سالی ١٩٦٧ بە هەلکەندنی ٨٣٢,٠٠٠ تۆن لەم کانە تورکیا لە دووا یەکیەتی شۆرەوی‌دا بە دووەمین کرۆم دەرهیٚنەر گەیشت. راپۆرتی جهانی وای راگەیاندوە کەوا لە سالی ١٩٧٣دا دوو ملیون تۆن لەم کانە لە ترکیا بەر هەم هیٚنراوە. بەشی زۆری ئەم کانە بۆ ئەمەریکا نیٚرراوە.

بەرهەم هیٚنانی سفر کە لە ئەرغەنی نزیك بەدیار بەکر دەردەهیٚنریٚت گەیشتوە بە ملیونیٚك تۆن لە سالی ١٩٧٠دا.

بەرهەمی ئاسن لە (دیفریگی) دا بە ملیۆنو نیو لە سالی ١٩٦٧ گەیشت. هەر وەها خەتیٚ شومەندوفیٚر چەند ناوچەی کورد دەگریٚتەوە...

بەشیٚك لە بازرگانە گەورەکان لە دیار بەکرو ئەرزەروم لە گەل هەندەران ئالوگۆر دەکەن...

تـەنیا ١٧٩ [واتـە ٩٪] دایەرەی بەنـك (مـەسـرەف) لە كـوردستـان دامەزراوە، بەرامبەر بە ١٩٨١ دایەرە لە گشت وولاٌتدا. پارەی یارمـەتی ئەم دایەرانە لە ناوچەكانی كورد ئێگجار كەمە بە پێچەوانەی بەشەكانی تری توركیا. هەروەها جۆرە قاچاغچییەتیەك لەسەر سنوور هەست پێ دەكرێت.

دایەرەكانی حكومەت (١٪) لە دانیشتوانی كوردستان بەكار دێنن. كورد فەرمان رەوایی بچوك داگیر دەكەن.

## شەری سەربەستی توركیا (١٩١٩ ـ ١٩٢٣) وكورد

هەر وەكو موستەفا كەمال بە ئەنەدۆل لە مـایسی ١٩١٩ دا گەیشت، خۆی راسەخۆ وەكو «رزگاری خوازی كوردستان» لە قـەلەمدا، هەمیشـە وكو پارێزگەری (خەلیفە» ی بەندكراو لە لایەن هێزی داگیر كەرو وەكو ئازادكەری عەردی ئیسلام خۆی پیشان دەدا؛ بانگەوازی ئەمْ سەرۆكە بۆ «هەمو موسلمانان» واتە بۆكوردو تورك و بۆ یێكەتی هەمووئەم گەلانە لە پێناوی خەبات بۆدەركردنی بێگانە لەم خاكانەدا بوو. لە سەرەتادا ئەم سور بوولەسەر برایەتی توركوكورد..

بیكەم ئانجامی رامیاری جولانەوەی كەمالیەكان لە كوردستاندا ئەوە بوو كۆنگرەیێكی گەورە لە ئەرزەرومدا لە تەموزی ١٩١٩دا بەسترا. پەنجاو چوار نوێنەر لە پێنج ولایەتی كورد لە كۆنگرەكەدا ئامادە بوون. كەچی لە دیار بەكرو خەربوت و سعرت كەس ئامادە نەبوو.

كۆنگرەی ئەرزەروم یێكەم سەركەوتنی رامیاری فوستەفا كـەمال بـوو. چەكدارانی كورد لە ژێر فەرمانی كازم قەرە بەكر پاشا یێكەم سەركەوتنیان لە رۆژهەلاتی ئەنەدۆلدا بەدی هێنا... ئەم هێزە كوردە لە ئـازادكردنی ئـەنەدۆل بەردەوام بوو، وە دەوری زۆری لە سەركەوتنی دووایی لەشەڕی سەربەستیدا هەبوو.

ـ ماویەتی ـ

---

(١) لە كتێبی: گەلێكی بێ وولات ـ لەندەن ١٩٨٠

PEOPLE WITHOUT A COUN TRY (THE KURDS AND KURDIS TAN)

(EDITED BY G. CHALIAND). LONDON 1980

# شۆڕە سوارێکی لەبیرکراوی دەشتی گەرمیان


حسین بەرزنجی
کەرکوك


ماوەیەك لەمەوبەر لە گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە (١)ی خولی سێیەم کە لە مانگی ئازاری ساڵی (١٩٨٥)دا دەرچووبوو... چیرۆکێکی کاك (غەفوور ساڵەح عەبدوللای) تێدابوو کە لە ژێر ناوونیشانی (داستانی گوندێکی لە بیرکراو)دا نووسیبووی، وە لە کۆتایی جیرۆکەکەی و لە پەراوێزەکەیدا دەسس نیشانی ئەو شیعرانەی کردبوو کە لە نێو چیرۆکەکەی دابوو، دەڵێ:

(شیعرەکانی نێو چیرۆکەکە چەند بەیتێکی دەماو دەمی خەڵکی هەندێ لە شوێنەکانی گەرمیان و دەوروبەری شاری کەرکووك کە لە سەر کوڕێکی ئازاو.

نەترسی ناوچەکە هەڵبەستراوە کە ناوی (عەزەی سەید) دەبێ‌و بە دەستی پۆلیسەکانی حوکمی پاشایەتی گۆڕکراو کوژرا ئەم بەیتانەش بە زۆری کابرایەکی شێت دەیووت بە (جەبارە شێت) ناسراوبوو بەلام خۆم ناوەکەی‌و هەندێ لە بەیتەکانم دەسکاری کردووە). ئەم دەقی ووتارەکەی کاک غەفوور بوو. جا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو لاپەڕە شاراوەیەیی مێژووی ژیان‌و لەناو چوونی ئەو ڕۆڵە ئازاو چاو نەترس‌و هەڵکەوتووە، ئەو ڕۆڵە نیشان شکێن‌و جەربەزەو دەست ڕاستە دەخەینە بەرچاو خوێنەرانی خۆشەویست. ئەم ڕۆڵەیە هەڵۆیەکی چاونەترسی ئەو سەردەمە بوو کە هەر لە دوورەوە چاوی هەموو ئەو مرۆڤە ناپاکانەی دەرئەهێنا کە دەستیان بەسەر ڕژێمی ئەوکاتەدا گرتبوو.. بە هەموو جۆری ئازاری خەڵکی هەژارو قوڕ بە سەریان ئەداو ئەیان چەوساندنەوە.

بەڵێ ئازاو.. نەترس‌و... یاخی بوو، هەرگیز ملی بۆ ئـەو دالاشە گـۆشت خۆرانەی ئەو ڕژێمە بۆگەنە کەچ نەدەکرد کە ئەویش ڕژێمی پاشایەتی ئینگلیز بوو.

زیاتر کاتی خۆی لە شاخ‌و کێوو دەشت‌و دەر بەسەر ئەبرد هەر وەك شێر ئاسایی‌و هەر وەکو بڵێت من شێرم‌و جێگای شێریش بێ‌گومان دەشت‌و دەرەو ژیـانی سەربـەرزی‌یە. لەنـاوچەی قـەرەحەسـەن و دەوروبەری کـەرکووك‌و چەمچەماڵ بو ئەم ڕۆڵەیە یەکێ بوو لەوانـەی کە هـەر وەکوو سـەیدعـەتارو خولەپیزەو مەجید شانشینی‌و.. و.. و زۆری‌تر لەو جۆرە کەسانەی کە هەرگیز لە کاتی زولم‌و زۆرداریا ملیان بۆ ڕژێمەکانیان کەچ نەدەکردو یاخی دەبوون‌و چیاو چەك دەبووە هاوڕێ‌و هاوسەریان‌و دروشمی سـەربەرزی‌و سـەربەستی‌یـان هەڵدەگرت. بۆیە تا دوا دڵۆپەی خوێنیان هەر بەرگـریان ئـەکردوو لە شـەڕی بەردەوامدا بوون لەگەڵ سەربازو پۆلیسە چاو چنۆکەکانی ئەو سەردەمەدا.

ناوی تەواوی ئەم هەڵۆیە (عزیز سیدە عەلی) یە کە لە ڕەگەزەوە ئەچنەوە سەر شێخە بەرزنجەکانی (کانی‌کەوە) بۆیە تا ئێستاش خەڵکی ئـەو ناوچـەیە دەڵێن:

## تاقە گەنجەکەی شێخ کانی کەوە
## دوژمنی ئەکوشت لە نیوە شەوا.

هەر وەکو لە هەندێ شیعری فولکلۆری‌دا بە (عەزەی سەید) ناوی هاتووە، کە بە زۆر شێوە گۆرانی‌و ئاوازی تایبەتیان بۆ دائەناو ئەیان‌وتەوە، کە تا ئێستاش زۆر کەس هەیە کە ئەم جۆرە ئاوازە تایبەتی‌یەو هەڵبەستـەکانی زۆر بـە باش

دەزانی... بە تایبەتی لە خەڵکی ناوچەکە ژن، پیاوو گەورە منال ئەگەر زۆربەیان نەیزانی هەر گوێیان لێبووەو بیستوویانە... تەنانەت وەکو مەقامی ئای‌ئای‌و وەکوو لایەلایەو هەندێ جار وەکو قەتار الله وەیسی ووتراوەو زۆر جار لە کۆڕو مەجلیسا دەنگ خۆشەکان بە گۆرانی وپیا هەڵدان ئەو شیعرانەیان ووتووە بە تایبەتی ئەو کابرایە کە ناوی (جەبارە شێت) بووە کە خەڵکی گوندی (سیاەمنصوری) ناوچەی قەرەحسن بووە.

زۆر بە چاکی دەیووتەوە.... خەڵکی ناوچەکەش کاکە جەباریان خۆش دەویست بۆیە بە جۆوش‌و خرۆوشەوە گوێیان بۆ شل دەکرد.

ئازایەتی‌یەکەی بە جۆری بووە کە هیچ کات هاوڕی‌یەکانی خوێ نەیان توانیووە کە تۆزی قوولی بشکێنن وەکوو دەڵێن: لە هەموو جۆرە یاری‌یەکا بە تایبەتی ڕاکردن‌و سێ‌بازو بازدان‌و غارغارین‌و سوارچاکی‌و زۆران بازی‌دا هیچ کەسێکیان پێی نەدەگەیشتن. بەهێز بوو پرندەبوو دەمرەتی برسێتی‌و شەونخوونی نەبووە هیچ کاتی بە تەنگ لەشی خۆیەوە نەهاتووە هەتا بلێی ڕوح سووك‌و گورج‌و گۆڵێکی وەها بووە کە سەرنج ڕاکێش خەڵکی هەموو ناوچەکە بووە. وەکو ئاسکە. لە دەست ڕاستی‌و نیشان شکاندنا ئەوە هەر هاوڕێی کەم بووە هیچ کاتێ گوللەی بە خۆڕایی نەڕۆیشتووە دەڵێن گوایە چەند جار ئافرەتەکانی خزمی خۆیان کە لە کانی‌و ئاو هێنان دەهاتنەوە ئەویش لە دوورەوە نیشانەی ئەگرت لەو جەرەیا کۆزەیە کە بە سەر شانیانەوە بوو، لێی ئەداو جەرەکەی ئەشکان‌و ئاوەکە بەسەر لەشی ئافرەتەکە دەهاتە خوارەووە. یا دەڵێن گەر هاوڕی‌یەکی خۆی یا خزمێکی جگەرەی بە دەمەوە بووایە بە گوللە ئەیدا لە جگەرەکەو لە ناوەڕاستا ئەیکردە دوو کەرتەوە بە بێ ئەوەی گوللەکە بەر کابراکە بکەوێ. وە هیلکەی بەگولە لە ناو لەپی مرۆڤا هەڵگرتوە هەروەها دەڵێن زۆر جار ئاسکەو کەروێشکی بە دەم ڕاکردنەوە کوشتووە وزۆر جار دوو ئاسکەی بە یەك گولله کوشتووە... هەروەها چەندەها جارپێش ئەوەی دوژمن لێی بێتە دەس ئەم زووتر لە دەستی ڕاستی دوژمنەکەی داوەو پەکی خستووە. دەڵێن بە دەم غاردانی ماینەوە داوێتی لە نالێ ئەو ماینەی کە هی سوارەکەی پێش خوێ بووە بە بێ ئەوەی سمی ماینەکە زامداربێ یان جارێکیان لە بان مەقان تووشی ئەبێتە تووشی کۆمەڵێ لە پۆلیس‌و باش چاوشە شۆربا خۆرەکانی ئینگلیز. بە تەنها خۆی دەبێ‌و ئەوانیش (٩) پۆلیس دەبن هەر لە دوورەوە بانگی لێدەکەن: تسلیم بە کاك عزیز تسلیم بە ئەگینا کوژراوی، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت، بێ‌گومان بە گاڵتە پێ‌کردنەوە: وازم لێ بێنن بە خوا من بە ئێوە ناخورێم.

ئەوانیش دەڵێن: هەرگیز واز ناهێنین.

ئەم دەڵێت: بە خوای گەورە خۆتان (٩) کەسن لە نۆ گوللە زیاترتان پێوە نانیم وا بۆ نموونە جەبار چاوش خۆت ڕاگرە وا لە دەستی ڕاستت ئەدەم، هەر لەگەڵ قسەکردنەکەیا ئەدا لە دەستی ڕاستی باش چاوش. ئەوانیش وازی لێدەهێنن و خۆیان و ئەسپەکانیانەوە هەڵدێن. هەروەها لەو عادەتانەی کە هەیبووە هیچ کاتی ئاژەڵێ لە ناو خەوا نەکووشتووە ئەڵێن چەپڵەی لێدەداو ئاسکەکەی بە ئاگا ئەهێنایەوە ئینجا لە کاتی ڕاکردنا لێی ئەدا.

ئەمە چەند دێڕێکی کەم بوو لە بارەی خوو ڕەوشتی ئەو ڕۆڵە ئازایە کە لە کەس و کارەکانی خۆیم وەرگرتووە. خەڵکی ناوچەکەیش زۆربەیان ئەم ڕووداوانە ئەزانن و ئاگادارن وا لێرەشا هەندێ لەو دێرە شیعرانە بڵاودەکەمەوە کە دەماو دەم خەڵکی ئەیڵێنەوە و بە ئاوازی تایبەتی و بە دەنگە خۆشەکەی کاکە جەباری خوا لێ خۆشبو. جەبار ئومری سیامەنسوری کە پێیان ئەووت کاکە جەبار نەختێ گورانێکەی کاک عەزیز بڵێ ئەویش بەبێ سێو دو لێ کردن دەسی پێ ئەکرد مچوڕکە بە لەشی مرۆڤا ئەهات کە ئەی‌وت. (ئەرێ هۆهۆکاک عەزیز....).

دایك دانیشی ڕۆڵەی وابێنی
وەك عەزەی سەید پۆلیس بگلێنی
تا بەختی لە هات خودا یاری بوو
شورتەو باش چاوش شەرمەزاری بوو
کاك عەزیز وەك شێر بەر لە بەیانی
هەڵساو کەوتە ڕێی برنەو لە شانی
تاقە گەنجەکەی شێخ کانی کەوە
لە شکری ئەشکان لە نیوە شەوا
هۆ هۆ باش چاووش نەجمەکەت جوانە
خۆتم بۆ دەرخە بۆ گوللەی کارخانە
تو خوا کاك عەزیز مەچوو جەبەل بۆر
خۆت مەکە نەچیر شورتەی مامر خۆر
نەم ووت کاك عزیز مەچۆرە بەرزی
نەوەك بتکوژێ گوللەی ئینگلیزی

ئاسکەکان مەقان بەر بەرەڵڵایە
چونکە دەنگ بڕنەو کاك عزیز نایە
ڕەشاشیان دابەست لە بان شاخەکان
کاك عزیزیان کوشت لە ناو باخەکان
کاکە شێخ عەزیز سمێڵ قەیتانی
کێبوو وا تۆی کوشت سۆزەی بەیانی
ئەرێ هۆ هۆ..... فیشك لغ لە پشت
چۆن لە دڵت هات کاك عەزیزت کوشت

ئەم کوڕە ئازایە لە یەکێ لە ڕۆیژە تۆف و کڕێوەکانی ساردی زستانا کە یا لە ساڵی ١٩٤٤ وەیا ١٩٤٥ بووە بە تەواوی بۆم ساغ نەبووەتەوە چ ساڵێکە.... بە پیلانی پیس و گڵاوی چڵکاو خۆرەکانی ئەو کاتە و ئینگلیز، دەمەو بەیانی یەکی زوو دەوری ئاوایی (شێخ جگری) ناوچەی قەرەحەسەن لە هەموو لایەکەوە ئەگرن و ئەیکەنە تەق و تۆق و دەس ڕێژ کردن....

کاك عزیز ئەو کاتە لە ناو گوندەکە دەبێ و زیرەکانە بڕنەوەکەی هەڵئەگرێ و ئەیەوێ خوێ بگەیەنێتە ناو باخەکان تاکو سەنگەریان لێ بگرێ و نەهێڵێ بێنە پێشەوە... بەلام فریا ناکەوێ و ناتوانی بگاتە شوێنی مەبەست، هەر چەندە چەند تەقەیەك ئەکات و چەند کەسێك زامار دەکات و لە دەستی ئەو پۆلیسە دەدات کە ڕەشاشەکەی بە دەستەوەیە بۆیە سڵ لێ ئەکەنەوە ماوەیەك بێ دەنگ ئەبن ئینجا لە پشتەوە فرسەتی لێوەرئەگرن و شەهیدی ئەکەن... لەو کاتەیە تەمەنی ئەو هەڵۆ بەجەرگە (٢٦، ٢٧) ساڵ بووە، دوای ئەوەی خوێنە سوورە گەشەکەی دارو بەردی گوندەکەی و خاك و خۆڵی گوندەکەی ئەنەخشێنی داستانێکی تری قارەمانی بۆ گوندەکەی تۆمار دەکات... گیانی پاکی بە خاکی گەرمیان ئەسپێرێ و تەرمەکەی ئەهێننەوە بۆ شاری کەرکووك و لە گۆڕستانی شێخ محی الدین بەو خاکە پیرۆزەی خەلات دەکەن.

هەزاران سەلاو لە گیانی پاکی خوا لێ خۆشی بوو هەموو ئەوانەی وەکو ئەو شوڕە سوارە لە پێناوی خاك و سەربەرزی دا بەرەنگاری پۆلیس و چڵکاو خۆرەکانی ئەو ڕژێم و ئەو سەردەمە بوونەتەوە.

---

سەرنج: لە پێش هەمودێرە هەڵبەستەکانا وشەی (ئەرێ هۆهۆ کاك عەزیز)ی ئەخستە ناوی دێرە هەڵبەستەکانەوە و بە ئاوازێکی بە سۆزی خەمناکەوە ئەوترا.

رێكێش ئامێدى
دهوك

تشته‌كێ ئاشكه‌رايه كو توره وێنه‌كێ (فوتوگرافى‌يه) بو ژين و ژيارا ملله‌تا ئو نه‌ينكه‌كا (خوديكه‌كا) روهنه مروڤ چاك تێدا دبينيت وان پێلێت مێژويى يێ بسه‌ر ملله‌تارا بورين.

ژبه‌ر ڤێ ئێكێ ئه‌گه‌ر مروڤ چاك هزرا خو دكوردستانێ‌دا بكه‌ت ئو باش به‌رێ خو بده‌ته ملله‌تێ كورد دێ مروڤ زانيت كو گه‌له‌ك ژمێره توره بيت دناڤ مه‌دا په‌يدابوى دگه‌ل خويابونا نژادێ كوردى لكوردستانێ‌دا.

ژره‌خه‌كێ‌دى ئه‌گه‌ر ئه‌م باوه‌ربكه‌ين كو ئه‌ڤ نژاده به‌رى (٣٥٠٠) سالاً خو جهێ كوردستانێ‌يه ئو ئه‌م بزانين چ ملله‌تا ژته‌مه‌ت ملله‌تێ كورد ژار و ژيرى نه ديتيه ئو ديسا چ ملله‌تا وه‌كى ملله‌تێ‌مه ئاهين و نالين و سته‌م و ڤه‌كوشتن لسه‌ر ده‌ستێ بيانيا نه ديتيه ئو كه‌سێ هنگى‌وا ژێرده‌ستى نه ديتيه هه‌ر ژده‌مێ پيچبونا (ده‌وله‌تا ميديا) هه‌تا روژا ئه‌ڤرو.

ڤێجا ئه‌و كه‌سێ ڤا تشتێت ژوورى بزانيت دێ هه‌ر زانيت كو تورێ مه‌ژى هه‌مى ده‌ما دگه‌ل مه يێ هاتيه دانانێ ئو يێ هاتيه دارێتن ئو جارا مه‌زنا گوتى (چ دكه‌نه كارێ ئه‌و تێته خارێ). ئو ئه‌گه‌ر ئه‌م ژلايه‌كێ ديڤه به‌رێ خو بده‌ينه ڤا چيا و گه‌لى و زيرك و نهالا بيت تژى كانى و ئاڤێت سار ديسا ڤى ملله‌تێ خنێ ژگه‌نج و تولاز و كچێت نازدار ئه‌ڤ تشته هه‌مى بونه ئه‌گه‌ر كو هوزان چێببن و بهێنه خوار.

تورێ كوردى چه‌ند توخمن:

تورێ کوردی تێته لێکفەکرن بدوو رەنگا:ـ
١ ـ تورێ کلاسیکی
٢ ـ تورێ رومانسی
١ ـ تورێ کلاسیکی:ـ
ئەو تورەیە یێ پیڤان و کێشان و بەرانبەرکرن ئو هەلسەنگراندن تێدا هەبیت ئو ئەم دبینینە ڤی رەنگی هوزان (شەعر) هەر چەندە ئەڤ ناڤە گەلەکێ کەڤن نینە بەلکی پشتی دیاربونا بسلمانەتییێ یە لەجهێ کوردا.[1]
ئو ئەوکەسێت بڤی توخمە تورەیڤە مژیل بوین ئو ڤەهاندین هەمی ژزانا و خاندەڤان و تێکەهشتیا بوینە وەکی:ـ
١ ـ بابا راخ راوندی یێ کو دچاخێ چارێ کوچیدا ژیای ئو ئەڤ هوزانڤانە خەلکێ هەکاریا بو.
٢ ـ بابە راخێ هەمزانی سالا ١١٢٣ ز یێ مری[2].
٣ ـ بابە تاهرێ هەمەدانی
٤ ـ عەلی تەرموکی (تەرماخی) ئەوژی خەلکێ هەکاریایە.
٥ ـ عەلی حەریری هەڤ چەرخێ هوزانڤانێ فارسی (فردەوسی) بو کو فردەوسی دڤێ مالکا هوزانێدا ناڤی عەلی حەریری بچاکی یێ ئینا:
(مردی دیدەم دەر جزیر شیری دیدەم دەر حەریر).
٦ ـ مەولەوی (١٨٠٦ ـ ١٨٨٢) ز
٧ ـ مەلارێ جزریری (١٥٩٠ ـ ١٦٤٩) ز
٨ ـ ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠ ـ ١٧٠٦) ز
٩ ـ مەلا حسینێ باتەیی.
١٠ ـ مەلا مەنسورێ گێرگاشی کولدیماهیا چەرخێ یانزدێ کوچیدا یێ ژیای.
١١ ـ شێخ نورالدینێ بریفکانی (١٢٠٥ ـ ١٢٦٨)ك کو (٦٣) سالا ژیایە.

د. بلیچ شێرکو دبیرهاتنێت خودا دبێژیت ژزاردەڤێ (ن. ڤیلیامینوڤی) زانایێ ئیرس یێ بناف و دەنگ: کو زانایێت شینەوارا (علماء الاثار) یێ بسەر دوو کێلیا هەلبوین لباکورێ (ژووریا) ئیرانی هەر ئێکێ ژووا کێلیا چەند پارچە هوزانێت کوردی لسەر نفیس بون پارچەك ژووا هوزانەکا کلاسیکیا کەڤن ژتوخمێ کلاسیکیا کوردییا کەڤن یا مروڤەکیبو ناڤێ وی پورا بوژ (PORAPOj) بو.
ئو یا دی ژتوخمێ رومانسی بو یا تورەڤانەکێ نەنیاس بو ئو دبێژیت (ن. ڤیلیا مینوف) مێژویا ڤا پارچە هوزانا دگەهیتە سالا (٣٣٠ ـ ٣٢٠) بەری بونا مەسیحی.

بو نموونه ئەڤە پارچەك ژهوزانا بورا پوزژی: یێ كو نێزیكی (۳۲۰) سالا بەری بونی ژیای:ـ[۳]

| | |
|---|---|
| خـوازدی ئـەز تـو بـهیـڤـرابـین | بـهـیـڤـرا هـیـریـن خـوریـنـی |
| وەر دی بـهـیـریـن گـوتـرا بـین | بـانـگ دیـن بهیـڤـرا نـاریـنـی |
| دیـونـی، گـوتـرا هـی رابـوم | ئـاواز ژچـر دخـویـنـی |
| ڤـیـرا پـیـل و بـەیـابـان | هـاوار ژدەسـت ئـەڤـیـنـی |
| ئـەز تـو، واتـو، یـەكـویـن | هـیـزان جـوا دی دیـنـی |
| ڤـیـرا پـیـكـرا خـوفـتـە ویـن | بـچـریـنـی، یـا بـنـڤـیـنـی |

ئو ئەڤا ژێری پارچەكا دی ژهوزانەكا نەنیاس یا كو دیسبا ل ژووریا وەلاتێ ئیرانێ هاتیە دیتن كو ئەوژی ژتوخمێ رومانسی یە ـ ستران ـخوبی لەلیف خریپانی

چاخێ روهلی (هیل)

لە بنیا گولی

لەجوش و پەیمانا ولی لی دلا لی دلا
ئەنگشین «هیل» سوزترە وا راهی گولی ؟

دلا: بووا «هیل» خوشترە
وا: راخی گولی ؟

گەردون، وا ببە پەناهو پەنار

وا گولی ؟

«هیل» ژومەرا ببە هیلز و یار

وا گولی ؟

دلا: ئەنگشین «هیل» سوزترە، واراهی گولی ؟

دلا: بووا «هیل» خوشترە
واراخی گولی ؟

وەرن دا جارەكادی ڤەگەرین سەر تورێ كلاسیكی یێ كوردی مە گوتبو:
تورێ كلاسیكێی كوردی ئەو تورەیە یێ چیڤان وكێشان و هەلسەنگاندن ئو

لێك ئێناندن تێدا هەبیت ئو بەرانبەركرن دكەرێ پێشییێ (شطر) ئو یێ پاشییێدا (عجز) هەبیت وەكی:

١ ـ ئیرو ژنو پر ئاتەشم دیسا ژرەمزا دولبەرێ[٤]
مەجروحێ قەوسی پروەشم تیردانە نیڤا جەگەرێ.

٢ ـ گومبدە ئاهـو فیغان ولەرزە وكوڤانە دل
دل دولدا یێ دسوژتین پیش و كـا و

خەرمانە دل نیڤ شەڤێ زێمار ددەرچیت روندكێت
كـەل هاتنـە خار ئـەڤـروكـانێ مـە

حـەكیم و هـوگـرو دەرمـانـە دل

د. مسعود كتانی

٣ ـ بـسـكـان تـو ژخـمـریـان جـودا كـە[٥]
زولفـان شـەكـە بـێـكـڤـە بـەر هـەواكـە
دا سـونـبـول و سـورگـول آشـنـابـن
ریـحـان و بـنـفـشـە تـابـە تـابـن

٤ ـ ل روێ ئـاڤـا دەمـێ ئـێـڤـار
مە دین دیتا لسەر بانی رەشە پوشی كـری بو خـوار
بـرویـسـك كـەفـتـیـنـە ئـەسـمـانـی

تو نوكە چاك بەرێ خو بدە ئەڤ هوزانێت بورین دێ بینی هەمی بكێشان و پیڤانن ب هەلسەنگاندن ئو لێكدانن، كەرێ پاشییێ بەرانبەری كەرێ پێشییێ‌یە دكێشانێ‌دا، تورێ كلاسیكێی كوردی نێزیكی (٢١) دەریا بیێت دهەین.

٢ ـ تورێ رومانسی:

هوزانا رومانسی چێ‌دبیت هندەك ژووا سێ گوشەبن هندەك چوار گوشەبن ئان پێنچ گوشەبن ئانكو پێتر ژی بن ئو گەلەك جاراژی دێ دیماهیك هێت سەر بەندەكێ وەكی:

هـای گـولی گـولێ گـولێ ئـەسـمـەرێ نـازێ گـولێ
مـە سـلاڤـە لئـەردێ تـو لێ ئـەسـمـەرێ نـازێ گـولێ

ئو دیسا وەکی:

ئەزدێ بسەرێ سیپانێ بێژم بکەروڤە ئو بمژە لاوکێ منا چەند جارا من خو هاڤێتە بەختێ تەدا تو بەس ڤی دیمێ شرین لمن بکە گژە لسەر ڤێ ئێکێ ئەڤە ناڤێت هندەك هوزانڤانێت رومانسی بێت کو لناف مە رابوین:

١ - بەکر بەگێ ئەرزی کورێ بەهدەر بەگێ یێ کو سالا ١٧٦٧ ز ژدایك بوی خودانێ ڤا بەیتێت (داستانێت) ژێری:

ا - بەیتا کەوێ ١٧٨١ ز.

ب - بەیتا چولی بەگێ ١٨٠٦ ز.

جـ - بەیتا طەرگێ.

د - بەیتا بهارێ.

٢ - حاجی قادرێ کوڤلی: ئەڤ هوزانڤانە خەلکێ گوندێ کوڤلێ بو ئێکە ژگوندێت دوسکیا یێ چوویە بەر دلوڤانیا خودای دسەدێ چارێ مشەختیدا.

٣ - حەسەن بامەرنی کورێ مەلا ئەحمەدێ بابەکیە بگوندێ بامەرنێ یێ ژدایك بوی سالا ١٨٦٨ ز ئو لوێرێ یێ مری سالا ١٩٤٠.

٤ - نادر کانیسارکی: خەلکێ گوندێ کانیسارکێیە ئەڤ گوندە ئێکە ژگوندێت بەروارێ بالا ئەڤی هوزانڤانی ژیێ خو هەمی بشڤانیێڤە بر یێ دویربو ژتێکەلیا زانا و تورەڤانا سالا ١٩٤٨ ز یێ مری.

٥ - فەقێ تەیران: دنیڤا چاخێ یانزدێ کوچیدا یێ ژیای.

٦ - شێخ تاهایێ مایی یێ کو سالا ١٨٤٣ ز ژدایك بوی لگوندێ مایێ ئو سالا ١٩١٩ ز یێ مری خودانێ (بەیتا دەرزیکێ).

تورێ رومانتیێ کوردی دبیتە دوو پشکێت مەزن:ـ

ا - ستران:

ستران کەڤنترین پارچەیە ژتورێ فولکلورێ.

ئەڤ هونەرە گەلەك ژکەڤندا یێ پەیدابوی هەر چەندە جڤاك لوی دەمی دپێلێت نزمدا دژیا ژلایێ رەوشەنبیریڤە.

هندەك زانا یێ لوێ هزرێ کو سترانێت شڤانا ژهەمی رەنگێت دی بێت سترانا کەڤنترە چونکی ئەو وێ هزرێ دکەن کو شڤانی کەڤنترە ژچاندنێ ئانکو مروڤێ بەرێ (کەڤن) شڤانیا کری ئاژەل و چاڤی یێ بخودان کرین بەری کو بزانیت چاندنێ بکەت.

ژلایەکێ دیڤە دێ بینین کو فولکلور دوو هزرا بەرچاڤ دکەت سەخمەراتی دیارکرنا دەستپێکرنا سترانێ ئو ئەو هەردوو هزر ژی ئەڤەنە:ـ

١ ـ هزرا ئێكێ: دبێژیت كو سترانێت كاركرنێ (شول كرنی) كەڤنترن ژهەمی رەنگێت دی.
٢ ـ هزرا دوویێ: دبێژیت سترانێت ئولی (ستایشێت ئولی) كـەڤنترین رەنگێت سترانانە.

سترانێ گەلەك رەخ و روێت ژیانێ یێت ڤەگرتین ئێك ژووا رەخا (دیروكە) ئو بو نموونە ل‌ئەوروپا بارا پێتر زسترانێت وا لسەر جوتیاریێ و شڤانییێ بون لدەمێ بەرێ بەلێ پشتی شورەشا پیشەسازی (الثورە الصناعیە) لناف رابوی كودگەل هندێ دیروكا وەلاتێ ئەوروپا هاتە گوهرین سترانبێژێت وان دەست هاڤێتن ستران بپالە و كارخانادا گوتن.

ئو یا هەژی‌یە ئەم نوكە ئاڤریەكێ بدەینە سترانا كوردی كو دێ بینین ئەف رەخ و روی‌یە یێت ڤەگرتین:ـ
١ ـ سترانێت داوەتێ (سەرێ زاڤای و نارینكێت بیكێ).
٢ ـ سترانێت كور و كچا (حەیرانوك).
٣ ـ سترانێت پیرە پائیزوك.
٤ ـ سترانێت گیا دورینێ.
٥ ـ سترانێت شڤانا.
٦ ـ سترانێت دستار هێرانێ.
٧ ـ سترانێت بچیكا وەكی (هەڤال هەڤالوشكێ)
٨ ـ سترانێت دبەر لاندكێرا (دەلوری).
٩ ـ سترانێت ئادە و شێلانا برنجا.
١٠ ـ سترانێت هێزوكێ.
١١ ـ سترانێت شەر و جەنگا (لاوك)
١٢ ـ سترانێت زێمارێ (تازیا).
١٣ ـ ستایشێت ئولی.
ئو........... هتد.

ئو یا هەژی‌یە كو مە ناڤێ هندەك سترانبێژا ژبەربن یێت كو ژدلەكێ زەلال و پری باوەر سەركێشیا كاروانێ سترانا كوردی كری ئو بو نموونە ئەڤە هندەك ژووا:
١ ـ حەمەكورێ بادینی (حەمكێ توڤی).
٢ ـ زێرویێ هەكاری.
٣ ـ هەرەگولێ بوتانی.
٤ ـ مریەم خان.

٥ ـ كاويس ئاغا.
٦ ـ سەعيد ئاغا و........ هتد.
٣ ـ داستان (بەيت)
داستان گرنگترين پارچەيە ژفلكلورى[٦] ئـو ژهەمى رەنگێت دى يێت فلكلورى پێتر داهێنان (ابداع) يا تێدا هەى.
داستان رويدانەكە بشێوەكێ چيروكى تێتە گوتن ژلايێ سترانبێژەكى ڤە ئو ئەو چيروك برەنگەكێ پەخشانێ يا هاتيە دارێتن ئو ژناڤدا هندەك گفتوگو. يێت تێدا هەين ئەو گفتوگو ژى هەمى پارچێت هوزانێ نە بكێش و ڤەكێشن ئو تشتەكێ دجهێ خودايە كو پێشكەفتنا داستانا يا پەرچيمەكريە ب پێشكەفتنا مللەتى ڤە.
هنديكە داستانە پلێت سەركەفتن و داكەفتنا دەستەكەكێ ئان يا مللەتەكى بەرچاف دكەتن لدەمەكىدا، بو نموونە هەچێى نوكە كوير داستانا مەم و زينا بخوينيت دێ چاك زانيت كو مللەتێ مە يێ كورد لسەردەمێ ئەحمەدێ خانى د چ كاودانادا دژيا، ئانژى هەچێى چيروكا خەج و سيامەندى گولێبوى چاكى زانى كانێ كچا كورد هەتا كيژ پەيسكێ دمينيتە سەر سوزاخو ئو يا بەرهەڤە خو بدەتە كوشتن سەخمەراتى هندێ كو سوزا خو نە شكێنيت.
ئانژى ئەو كەسێ داستانا شێخێ سەنعانى گولێ ببيت دێ بو دياربيت كو ئەڤينێ چ توخيبێت خونينن.
براستى من لبەرنينە ئەزگەلەك خو بەردەمە ناڤ ڤى بابەتێ كوير ودويردا بەلێ دسەر هندێرا يا فەرە بزانين كو كەڤنترين داستان هاتنيە ديتن داستانێت سومەرينە (٢٥) چەرخا (سەردا) بەرى بونێ وەكى داستانا (گلگاميش) يا كو بەهرا پێتر ئەفسانە تێدا.
ديسا داستانێت يونانى گەلەك دكەڤنن وەكى (ئيليادە) و (ئوديسا) يێت هوميروسى لچەرخێ نەهێ و هەشتێ بەرى بونێ نڤيسين ئو لديف ڤانڕا گەر ئەم سەحكەينێ دێ بينين داستانێت هندى يێنج چەرخا بەرى بونێ يێت دهـاتينە دانان وەكى داستانا (مەها بەهـاراتا) و (راميـانا)، ئـو داستانـا (ئينيدا) يـا (ڤێرجيل) ى كو ئێكە ژداستانێت لاتينى يێ بناڤ و دەنگ ئو لديماهيێ دێ بينين داستانا (شەهنامە) يا فيـردەوسێ فارسى. داستـانا هـەر مللەتەكى رەنگـەكێ ديمەنێ تايبەتى دگەل مێژوويا وى مللەتى دياردكەتن لەوما ئەم دكارين ببێژين كو داستان پارچەكە ژديروكێ.
داستانا روژهەلات:
هندەك داستان يێت دهەين هەڤبشكن لناڤبەرا مللەتێت روژهـەلاتێ ئو بگەلەك زمانا يێت دهاتينە نڤيسين و ڤەگێران بەلێ نە مەرجە كو لناڤ هەميادا

بئێك رەنگ بهێنە ڤەگوهاستن جارا هەی شینەوار ئان ناڤێت قارەمانێت وێ داستانێ تێنە گوهرین هەر ملله‌تەکێ لدیف وی ئو سەر ڤێ ئێکێ هندەك داستان ێیت دهەین بچەند زمانا ێیت دهاتینە نڤیسین ئو هەر ملله‌تەك ژووا بخو دادنیت وەکی.

داستانا (شیرین و فەرهاد) بکوردی و فارسی و تورکی و ئازربایجانی و هندەك زمانێت دی ێیت روژ هەلاتێ یا هاتیە نڤیسین ئو هەر ملله‌تەك ڤێ داستانێ بخو دادنیت بەلێ پا ئەم دبێژین کو تەقە داستانەکا کوردایە چونکی هەتا روژا ئەڤرو چیایێ بیستونی جهێ رویدانێت ڤێ داستانێ یێ لناڤ ئاخا کوردادا ئو هەر وەکی یا ئاشکرا کو ئەڤ داستانە بزمانێ فارسی یا هاتیە نڤیسین ژلایێ (نیزامیێ گەنجەوی و ئەمیر خوسرەوی دەلهەوی) ئو دیسا بزمانێ تورکی یا نڤیسی ژلایێ (نازم) حیکمەتی) ڤە ژبلی ڤێ داستانێ دێ بینین داستانا (لەیل و مەجرویم) یا لناڤ مە بەلاڤە هەر وەکی یا لناڤ عەرەبا بەلاف بناڤێ (لەیلا و قەیسێ کورێ مولەوەحی) یا کو هاتیە نڤیسین زلایێ (ئەحمەد شەوقی) ڤە بناڤێ (قەیس ولەیلا) ئو ئەڤ داستانە دیسا یا هاتیە نڤیسین بزمانێ تورکی ژلایێ (فضـولی) ڤە ئـو بفارسی یا هاتیە نڤیسین ژلایێ (نیزامی گەنجەوی) ئو یا هەژی گوتنێ یە ببێژین کو هەر ملله‌تەکێ ئەڤ داستانە لناڤ هاتیە نڤیســین بشەقلەکێ تـایبەتی (طابـع خاص) یا نڤیس و یا بخو داناى ئو جهو و جل و بەرگێت وێ ێیت بخو دانایــن.

**داستانا کوردی:**

داستانا کوردی دبیتە دوو توخمێت سەرەکی

١ ـ داستانا قارەمانی:

پەیڤا قارەمان، ئازا، پلیمەت پەیڤەکا بها گرانە لناڤ ملله‌تێ کورددا ئـو مروڤێ قارەمان جهەکێ تایبەتی یێ دناڤ جەرگێ هەمی ملله‌تیدا هەی ئو ئەگەرا وێ چەندێ‌ژی ئەو تەنگاڤی و دەرد و ستەم و نەخوشینە ێیت کو بسەر ملله‌تێ مەدا هاتین ئو دەرباری ڤێ ئێکێ مەزنێت مە یێ گوتی:

(بمرە بسەر بلندی بەلێ نەژی بسەر شورێ).

(دیکلێ روژەکێ‌بە نە مریشکا سالەکێ).

(گەر ئازادی بومە نینە مرن بومە ژینە) لدیف ڤێ چەندێ ئەم نەچار دبین شەری دگەل دوژمن و دلخارا بکەین ئو بسەدا مروڤێت چەلەك و بجەرگ لناڤ مە رابون دیروکا خەملاندی بکریارێت خـو ێیت بها گـران، ئو بـراستی ئازایی و قارەمانی یا بویە پارچەك ژژیانا ملله‌تێ مە ئـەڤ تشتە یـا خویـا و ئاشکـرایە دداستانا (خانێ لەپ زێرین) دا دەمێ ئەو رازی نەبوی بسەر شوری بژیتن بن دەستێ شاهێ فارسی[٧] داستانا قارەمانی چیروکە هاتیە گوتن بسەرەکی لناڤبەرا

دوو جینا ئان دوو مللەتا هەلبەت ڤێ چیروکێژی قارەمانێت خو بێت دهەین ئو لدیفرا هوزانڤانەکێ هاتی ئەڤ چیروکە یا داریژتی دچار چوپەکێ هوزانیدا ئو ئەگەر هاتو مە ناڤێ وی هوزانڤانی کا کییە ئەڤ داستانە ژفلکلوری دێ چینە ریزا توری نوسراو (یێ بخودان).

لناف وەلاتێ مەدا بهزارەها شەرو جەنگا یێ رویدای ئو گەلەك ژووا بێت بوینە داستان و ئو دەستەك لدیف دەستەکی یێ ژبەرکرین ئانژی بێت دهاتینە نڤیسین ژلایێ هندەك هوزانڤاناڤە کووا بێت ریزگارکرین ژدەردێ مرن و نەمانێ ئو بو نموونە ئەڤە ناڤێت هندەك ژووا داستانا.

١ ـ خانێ لەپ زێرین (بەیتا خانا).

٢ ـ عەمێ گوزێ و بشارێ چەتوی ٣ ـ سیەبان ٤ ـ دوانزدە سواری مەریوان ٥ ـ چولی بەگ ٦ ـ شەرێ تیارێ ٧ ـ شەریف هەمەوەند ٨ ـ کاکە میر ٩ ـ خانزاد و لەشکەری ١٠ ـ ئاڤدەرا ١١ ـ بەیتا حەسەن و حوسەینا و..... و... هتد.

ئو ژبلی ڤا داستانا کو مە ناڤێت قارەمانێت وان زانین گەلەك قارەمانێت دی یێ لناف مللەتێ مە رابوین و سەرکێشیا مللەتی یا کری دشەر و جەنگێت گراندا هەر چەندە کو ئەڤە هێژ کەسێ نە داریژتینە برەنگەکێ داستانی ئو ئەگەر هندەك هاتبنە داریتن ژی ئەز نزانم بەلێ پا دسەر هەمیێرا ئەڤە نابیتە ئەگەرا هندێ کو ئەم وا قارەمانا ژبیرکەین وکریاریت وان یێت پڕ بها ب پشت گوهێ خوڤە پاڤێین ئو نموونە لسەر ڤێ چەندێ

١ ـ شێخ سەعید پیران ٢ ـ شێخ مەحمود یا کو ژلایێ کاویس ئاغای ڤە بویە ستران ٣ ـ گەنج خلیل دیسا ژلایێ کاویس ئاغایڤە یا بویە ستران ٤ ـ قازی محەمەد ٥ ـ سمکوییێ شکاك ٦ ـ ئەمینێ لاوێ پەریخانێ ٧ ـ دەرویشێ عەبدی و..... هتد.

بەلێ هەر وەکی ئەز دزانم بارا پێترێ ژڤا شەرا بێت بوینە ستران خەلکێ بێت گولێ بوین. دڤێرەدا ئەز گازندا ژهوزانڤانێت مە بێت نوکە دکەم کو هەتا نهو کەس ژووا بڤی کارێ پیروز نە رابویە کو شەرەکی ژڤا شەرا بکەنە بەیت و ڤەهینن ئو ئەو کەس بشێتن ڤی تشتی بکەتن و نەکەتن ئەو کەس مروڤەکێ خەمسار و گونەهبارە بهزارا چیروك لسەر شەو و جەنگ و ئەڤینێ یێ لناف مە پەیدابوین و بەرزەبوین ئو مە گولێ نە بوینە بەلێ پا دەولەت ژسەرێ ڤان هوزانڤانا (ئەحمەدێ خانی و فەقێ تەیران و مراد خانێ بایەزیدی و بەکر بەگێ ئەرزی و..... هتد) مە ئەڤ چیروك و سەرهاتیە بێت پڕ بها گولێ دبن ئو چجارا بەرزە نابن [مەم و زین،

شێخێ سەنعانی، زەمبیل فروش، بەیتا کەوێ و بەیتا چولی بەگێ، بەیتا تەرگێ، بەیتا بهارێ..... هتد]

۲ ـ داستانا دلداری (ئەڤینی)

(ئەگەر ئێکی ئێك نەڤێت دێ خەونێت نەخوش پێڤە بینیت).

دوژمن و نە حەزێت ملەتێ کورد ڤەدگێرا و دگوت (کورد ل چەل و چیارا دژین ژبلی شەرو جەنگا چ ژدونیایێ نزانن خودێ ئەڤین باهرا وا نەدایە) لسەر پارچا ئێکێ ژئاخفتنا وا کەسا: بەلێ راستە ئەم دشەرکەرین و گەلەك حەژ شەرا دکەین بەلێ دگەل کێ ؟

دگەل وی کەس یێ بهێت زورداریێ لـە بکەتن، دگـەل وی کەس بڤێت ئاخامە داگیرکەت دگەل وی یێ حەژ مروڤایەتیێ نەکەتن ئو تشتەکێ دیارە مە چجارا تولا خو بکەسێ نەهێلایە ئو ئەگەر خودێ حەزکەتن ئەم تولا خو بکەسێ ناهێلین. شاهێ فارسی دڤیا ئاخامە داگیرکـەت بەلێ خـانێ لەپ زێرین بـژینـا سەرشوری رازی نەبو کو بکەڤیتە بن دەستێ وی ئو بسەر بلندی مر. پارچـا دوویێ ژئاخفتنا بوری کو ئەم چ ژئەڤینیێ نزانین دیروکامە یا پری بەلگە و نیشانە کو ئەم ئەڤیندارین و ڤی تشتی بهایێ خو یێ گـران یێ لناڤ مـەدا هەی ئـو (ئەحمەدێ خانی) بو ڤێ چەندێ یێ چوی و گوتی:

هــەم ئــەهــلی نــەزەر نــەبــین کــو کــورمــانــج
عــەشــقــی نــەکــرن ژبــو خــوە ئــارمــانــج
تــێــکــدا نــە دتــالــبــن نــە مــەتــلوب
ڤــێــکــرا نــە مــوحــیــبــن ئــەو نــە مــەحــبــوب
بــێ بــەهــرەنــە ئــەو ژعــەشــقــبــازی
فــاریــغ ژحــەقــیــقــی و مــەجــازی

بەلێ خانیێ بێ بەڤل یێ دبێت:

بلا کەس نەبێت کو کورد چ عەشق و ئەڤینێ نزانن بهزارەها ئەڤیندار و بەردلك یێ لناڤ مە رابوین.

گەر هاتو داستانێت ئەڤینیێ بێت روژهەلاتێ ستێربن لئاسمـانێ توری جیهانی داستانێت ئەڤێنی بێت ملەتێ کورد وەکی هەیڤێنە لناڤدا چنکو یا دیارە کو ئەڤینداریێت مە مەم وزینا وخەج وسیامەندا و.... هتد ژیانا خو یا دانایە سەر ئێك ئو بێت خو داینە کوشتن هەر وەکو مە گوتی سەخمەراتی هندی سوزاخو نە شکێنن. ئەرێ ما چ ژوێ مەسترە خەجو خو دچیایێ سیپانێدا پاڤێت ئو مێرا پشتی سیامەندی لخو (حەرام) کەت ئەگەر کو ئەڤیندار نەبیت ژدلەکێ راست و دروست.

زين خيشكا ميرێ جزيرێ ئەوا كو ژينا خو هەمی بخوشی بری دێ چەوا خو ئێخيتە تالی و نەخوشيا ئەگەر سەرا مەموێی ئەڤيندار نەبا ئو يا ديارە كو ژ كەڤندا دەستەكا مير و حاكم و زەنگين و دەربەگا خزمانيا چينا هەژار و خەزان نە دكرن.

شێخێ سەنعانی گەر نە زانيبا عەشق و ئەڤينی چيە ! دا چەوا رابيتە پشتی (٨٠) هەشتێ سال ژی بوراندين ئو (٥٠) پێنجەهـ جارا چويە حەجێ و (٥٠٠) پێنجسەد مريد هەين نوی بو عاشق و حەژ (سەرطەمێ) دكەتن ئەو كچكا ئەرمەنی (فەڵە) ئودسەر ڤێ خورێرا ئولێ خو دهێليت و دچيتە سەر ئولێ دلدارا خو. ديروكا مللەتێمە يا پرە ژداستانێت ئەڤينیێ ئو ئەڤە چەندەك ژووا داستانا ژبو نموونە:ـ

١ ـ مەم و زين (ئەحمەدێ خانی) ٢ ـ شێخی سەنعانی (فەقێ تەيران) ٣ ـ زەمبيل فروش (مراد خانێ بايەزيدی) ٤ ـ خەج و سيامەند ٥ ـ لەعليخانا گوڤەی ٦ ـ شرين و فەرهاد ٧ ـ حەسن و مريەم ٨ ـ حەسو و زلخ ٩ ـ سێران خاتوين و خورشيدێ چاف بخال و..... هتد.

ژبلی ڤا هەردوو توخمێت داستانا (داستانا قارەمانی ودلداری) مە هندەك داستانێت دی يێت وهەين هندە رەخ و رويێت دی يێت ژيانێ يێت ڤەگرتين وەكی

١ ـ بەيتا كەوێ ٢ ـ بەيتا طەرگێ ٣ ـ بەيتا بهارێ[8] ٤ ـ بەيتا كيچێ ٥ ـ بەيتا كيژ و كورا ٦ ـ بەيتا كێتكێ ٧ ـ بەيتا قيامەتێ[9] و..... هتد.

ئو لديماهیێ هيڤيدارم ژهەمی خەمخور و دلسوزێت تورێ كوردی كو ستران و بەيتێت كەڤن كومكەن و بدەنە چابكرن بزيترين دەم ئو ديسا هيڤيدارم ژدەزگەهێك بە لافكرنێت كوڤار و روژنامێت كوردی پێتر پيتەی بدەنە بەيتێت كەڤن ئو بەلاڤكەن ئەگەر نەشێن ژی هەمی بەيتێ بئێك جار بەلافكەن بلا بكەنە سێ چار خەلەك سەخمەراتی ساخكرنا تورە و ديروكا مللەتێ كورد.

---

ژێدەر و ئالێری:

١ ـ گوڤارا روناهی ژمارا ئێكێ سالا ١٩٦٠ بن ٣٠.

٢ ـ الاكراد في بهدينان للمرحوم انور مائی ص ١٩٨.

٣ ـ گوڤارا روناهی ژمارا ئێكێ بپ ٣١.

٤ ـ ديوانا مەلايێ جزيری تويژان صادق بهاء الدين بپ ٤٤٧.

٥ ـ مەم و زين بپ ٩٤.

٦ ـ الواقعية في الادب الكردي د. عز الدين مصطفى رسول ص ٣٧.

٧ ـ ئەو داستانە يا خەباتا مللەتێ كورد دياردكەتن بسەروكاتيا خانێ لەپ زێرين دژی شاه عەباسێ ئێكێ شاهێ فارسی لناڤبەرا ساڵێت ١٦٠٨ ـ ١٦١٠.

٨ ـ ژڤەهاندنا بەكر بەگێ ئەرزی‌يە.

٩ ـ بەيتاقيامەتێ (بەيتا نەسيحەتا) ژڤەهاندنا ئەحمەد نالبەندی‌يە.

«بەشی دووەم».

# عبدالله جەوهەرو ڕۆژگاریکی ئەدەبی کوردی

ئومێد ئاشنا

سلێمانی ۱۹۸۵

بەشی یەکەمی ئەم باسە لە ژمارە دووی «نووسەری کورد»دا بلاوکراوەتەوە.

«هەلوێستی یەکەم»

ئەگەر بێتو بلێن بناغەی ڕەخنەی زانستی کوردی لەلایەن - ڕەفیق حیلمی -[1]یەوە دانرا بۆمان دەچێتە سەرو دەتوانین بیسەلمێنین. هەردو کتێبی - شیعرو ئەدەبیات -[2] و نوسینەکانی[3] تری نمونەی ئەم ڕاستیەن.[4] ئەمسالیش سێ سال تێپەڕ دەکات بەسەر کۆچی دوایی مامۆستایەکی ئەدیبو ڕەخنە گرو پەخشان نووسی وەك - عبدالله جەوهەر - ع. چالاك - دا. لەم یادەدا بەپێویستم زانی ئەو دوو نوسینە ڕەخنەییە کە عبدالله جەوهەر بە ناوی - ج -[5]ەوە چلو یەك سال لەمەو بەر سەبارەت بە لێکۆلینەوەیەکی ڕەفیق حیلمی نووسیبوی بخەینەڕوو. لەو کاتەدا کە نووسینو ڕەخنە گرتن لە ئاستی توانای داهێنانو زانستی ئەدیبێکی وەكو ڕەفیق حیلمی کارێکی شیاوو توانایەکی ئەدەبی بەرزی دەویست، بەلام «ع. چالاك»[6] ئەوەی سەلماند کە لە ڕەخنەی مەوزوعیو لەباردا بۆ خزمەت بە ئەدەب دیارە ئەدیبێکی وەك - ڕەفیق حیلمی - زۆری لا باش ئەبێتو ئەگەرچی مەسەلەکە خۆی دەگرتەوە.

لە بنەڕەتدا لێکۆلینەوەکەی ڕەفیق حیلمی سەبارەت بە دلداری شاعیر بوو - عبدالله جەوهەر - یش وەك نووسەرێکی ئەو سەردەمەو لەژێر ناوی - ج - دا ڕەخنە لە لێکۆلینەوەکە دەگرێت. لە دوای ئەمە نووسەرو مێژوونوس خوالێ

خـۆش بوو ـ ڕەمـزی قەزاز ـ بـە وتارێـك وەڵامی ڕەخنەكـانی ـ ع.چالاك ـ دەداتەوە، بەڵام بەداخەوە نەی پێكـاوەو نووسینەكەی تەنهـا لۆمە كـردنی ـ ع.چالاك ـە كە چۆن ڕێی خۆی داوە ڕەخنە لە نووسینی ڕەفیق حیلمی بگرێت. لە دوای ئەمە (ع. چالاك) زۆر بەهێمنیو بەشێوەیەكی مەوزوعیو زانستیـانە وەڵامی ڕەمزی قەزاز دەداتەوەو دوا جار خاوەنی بەهرەتی باس كە ـدلدار ـ[7]ی شاعیرە ئەمیش وەڵامی عبدالله جەوهەر «ج» دەداتەوەو هەر لە سـەرهەمـان ڕێبازی ڕەمزی وەڵامەكانی دەنووسێت. ئنجا لێرەدا بۆ ئاگادار بوون لە شێوەو چۆنیەتی ڕۆژانێكی ڕەخنەی ئەدەبەكەمانو لەیادی سێ ساڵەی كۆچی دوایی ـ ع.چـالاك ـی ئەدیبو ڕەخنـەگردا سـەرەتا ڕەخنـەكەی «ج» سـەبارەت بـە لێكۆڵینەوەكەی ڕەفیق حیلمی دەنووسین هەتا ڕەخنەگرانو نووسەران كاتێـك هاتنە سەر كاروانی ڕەخنەی ئەدەبی كوردیمان ئەم مەسەلەیەیان وەك خاڵێكی گرنگ لەیاد نەچێت. عبدالله جەوهەر واتە «ج» دەنووسێت «ئەمجارە لە سەرو گوێلاكی باسێك ئالاوم خۆم ئەوە هیچ، باوەڕیشم بە كەم كەس هەیە لەوێزەی پێ، ئەو باسە پڕ ئەندێشەو بەسامەش ـشیعرو ئەدەبیاتی كوردی ـیە كە بەقەڵەمی مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەگ ـ بڵاو ئەكرێتەوە، ئەگەر كەمو كوڕیەك لەم باسەدا بخەمە بەرچاوی مامۆستای ناوبراو تۆ بڵێی كەس بمێنێ نەحەپەسێو وەك شارە زەردەواڵە لێم نەوروژێن و ستارم لێ هەڵ نەگرن ؟! باسی كردنی شیعر زۆری پێ دەوێ نووسراوی ـ شاعرەكانمان[8] ـ ئەخەمە پێش چاوو ئـەڵێم شیعر تـەنها جوانیە، پەریەكە باڵدار، مۆسیقایەكە هەموو نەغمەیەكی مرچرك بێ، ئەمە كورت ترین مەعنای شیعرە، ئنجا فەرمون شیعرەكانمان بخوێننەوە بـزانن بۆ ئـاهی سوێند ئەبێ كامیان لە شیعر ئەچێ بۆیە من ئەڵێم شاعرمان زۆر كەمەو بەدەگمەن هەمانە. مامۆستا لە لایەكەوە ئەفەرموێ ـ جێگەی شك نییە كە دلدار شاعیری عەسریو ناوداری دوا ڕۆژ ئەبێ، لە لایەكی تریشەوە لە سەر قەسیدەی ـ قەلو ڕێوی ـ[9] ئەفەرموێ، ئەم فكرە بەلای منەوە لە دوای ئەوە كە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی جوانترو شیرین تر بووە. نازانم مامۆستا چۆن لەوەی ئومێدی لێ ئەكات یەعنی هێشتا نەگەیوەتە ئەو پایەیەی كورد چاوی تێ بریوە لە ملاشەوە چۆن داویەتە پاڵ شـاعیرێكی گـەورەی فرانسـە وەك و ـ لافونتـین ـ؟ دوبارە لە لایەكی ترەوە ئەفەرموێ، مندالێك كە هەموو ژیانی لەگەڵ خوێندن ڕابواردبێو هێشتا لە خوێندنی ڕەسمی ڕسكاری نەبووبێ نـاتوانێ ببێ بـە شاعیـرێكی ـ كسبی ـ یەعنی هێشتا شاگردەو شاعر نییـە، ئەی كـەوایە لەولاتـرەوە چۆن ئەفەرموێ خۆزگە هەموو لاوێكی كورد لەسەر ئەم پێو شوێنەی بڕۆیشتایە ؟ نازانین ئەگەر دلدار هێشتا هەر شـاگرو بێت لە ئـەدەبدا چـۆن هانمـان ئەدا

پەیڕەوی بکەین ؟!.»[١٠] هەر دوا بەدوای بڵاو بونەوەی ئەم ڕەخنەیە باسەکە بوە جێگای مشت و مڕی ناو کۆڕە ئەدەبیەکان. لە نووسینەکەی «ج»دا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ وەنیشانی پێکاوەو بوتە ڕەخنەیەکی مەوزوعی ئەم خاڵانەن:
١ ـ لەبارەی ئەوەی کەزۆری شاعرو بازاڕ گەرمی بونەوەی شیعر مانای ئەوە نی‌یە کە هەرچی نووسی شاعرەو ئەوەش کە بڵاو بوەوە بە مانای شیعر شیعرە.
٢ ـ نووسەر دلداری شاعیری وەها داناوە کە نەگەیوەتە پلەی شاعیری تەواو «بێ گومان ئەو کاتە واتە ١٩٤٤» وە چاوەڕێی دوا ڕۆژە کەچی دراوەتە پاڵ شاعیرێکی جیهانی وەك ـ لافونتین ـ.
٣ ـ ئەنجامی پرسیاری نووسەر وەها کەوتۆتەوە کە ئاوات دەخوازێ هەموو لاوێکی کورد وەك ئەو بونایەو لەسەر ڕێ و شوێنی ئەو بڕۆیشتنایە ئەویش دەپرسێ کە هێشتا ئەو لە شیعرا ـ کسبی ـ نەبێت وەشاگرد بێت چۆن پەیڕەوی بکەین ؟!.

دەقی دوەمی ئەم نووسینەمان ڕەخنەکەی ـ ڕەمزی قەزاز ـە کە پێشتر باسمان کرد، نووسەر دەڵێت:ـ
«١ ـ مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نووسیندا هەمیشە ڕبێی ـ تشجیع ـ ئەگرێ بە پێچەوانەی بۆ چوونی «ج».
٢ ـ لەو دەمەدا ئەو دەستی دایە قەڵەم ئێمە لەو بیرە دوور بوین.
٣ ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی تەنیا بە یەکێك نەسپێرراوە.

٤ ـ خۆ شاردنەوە لەم ڕۆژەدا «واتە نووسەر بە ناوی «ج»ەوە دەرکەوتوە» گوناهێکی زۆر گەورەیە لێ خۆش بوونی نیە. ئەگینا ئەمەش نەکەس لەگەڵ خۆ شاردنەوەشا ببی بە دڕك لە سەر ڕێی ئەدیبەکانمانا بڕوێ‌ی، لەوانیش بێ بەشمان ئەکەی.
٥ ـ ئێستا تۆش (واتە ـ ج ـ) لە قوڕولیتە مرواریت دەر نەهێناوە سەرەڕای ئەمەش کە هاتیە کایە دەست و کوتەك هاتوی ڕێ لە ئەدیبەکانمان ئەگری ؟!.»[١١].

ئەمە دەقی نوسینەکەی ڕەمزی قەزار سەبارەت بە ڕەخنەکانی ـ ج ـ کە دیارە ناچێتە ڕیزی ڕەخنەوەو ئاشکرا لایەن گرتن و نامەوزوعی ڕەخنە نیشان دەدات. وە ـ ج ـ لە چل و یەك ساڵ لەمەوپێشدا بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە.
«١ ـ جوانی خۆ شاردنەوە چی‌یە ؟ لە ناوچەیەکی وەك ئێمەدا بچوك نرخی نیە هەر چەند دانا بێ و باش بنووسێ.
٢ ـ ئەو کەسەی خۆی ئەشارێتەوە بە ڕەخنەو پلار چاوترسێن نابێ چونکە کەس یا زۆر کەس نایناسێ.

٣ ـ ئەگەر وتمان خۆشاردنەو(١) ناشیرینە نابێ هەر بەخۆمانەوە بوەستین ئەبێ ڕوو بکەینە عالەم چونکە کەم گۆڤار هەیە لەهەموودانەیەکیا یەکێك بەنەناسراوی خۆی نیشان نەدا بێ.
٤ ـ ئەگەر نیاز لە نووسین جوانیو بەکەڵکی بێ ناوی ببێ یا نەبێ نووسین ناشکێ خۆ ئەگەر بۆ ناسینی پیاوی گەورە بێ ئەم مشتو مڕەی بۆ چییە ؟ هەمویان باش ئەناسین.
٥ ـ ئەفەرموی ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات تەنیا بە یەکێك نەسپێراوە ـ گوایە من وتومە تەنها بە من سپێراوە ؟ نەك من هەموو کەس وەكو خۆت ئەفەرموی ـ هەموو کەس لە توانایا بێو بە خۆیا ڕاپەڕموێ لەم بابەتەوە دواوەو ئەدوێ ـ منیش خۆم بە یەکێك لەوانە نیشان داوە جا بتوانم یا نەتوانم ئەوە باسێکی ترە ـ.

لەلایەك ئەفەرموی ئەدەبیاتی کوردی زۆر قوڵە وەكو دەریایەکی بێ بن وایە. دیارە کە ئەفەرمویت ئەدەبیاتی کوردی قوڵە یەعنی زمانەکەشی پێشکەوتوە کەچی نازانم بە چە نیازیو بە چەباوەڕێ دوا بە دوای ئەوە یەك دو دێڕ بەسەر ناڕوا ئەفەرموی ـ زمانەکەمان زۆر لە دوایە پێش خستنی پێویست ترە ـ زۆر قوڵی ئەدەبیات لە کوێو لە دوایی زمان لە کوێ ؟!.».(١٢) لە کۆتاییدا مەبەستمان لەم چەند لاپەڕەیە ئەوە بوو کە ڕۆژگارێکی چلو یەك ساڵ لەمەو پێشی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لەیادی کۆچی دوایی سێ ساڵەی عبدالله جەوهەر ـی ئەدیبو ڕەخنە گردا بێنینەوە یادو وەك لاپەڕەیەکی شاردراوەو بایەخدار بیخەینە ڕوو بۆ گەشە پێدانو بەرەو پێش چوونی بابەتی ڕەخنە لە ئەدەبەکەماندا کە دیارە چەندە گرنگو سوود بەخشە.

هەڵوێستی دووەم:ـ چلو دوو ساڵ تێپەڕی بە سەر ئەو هەژاندنو تەقینەوە ئەدەبیەی کە ئەم نووسەرە(١٣) لە ڕۆژنامەی ـ ژین ـی ساڵی ـ ١٩٤٣ ـ(١٤)دا بەئەنجامی گەیاند، ئێمە لەم نووسینەدا نامانەوێ وەك شتێکی باو بەچەند دێڕێك یادی نووسەرێك بکەینەوە بەڵکە دەمانەوێ یادی دیاردەیەکی فەرامۆش کراو زیندوو بکەینەوە کە ئاوێنەی بێ گەردی ڕۆژگارێکی گرنگە لە ژیانی ئەدەبیو دەوری ئەدەب لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەدا. لەو مرۆڤە نەمرانەی هەمیشە نووسەرو شاعیرە لاوەکانی هان دەداو بەرهەمی بۆ بڵاو دەکردنەوە پیرەمێردی نەمر بوو، یەکێك لەو لاوە نووسەرە هەڵکەوتوانەی ئەو ڕۆژگارە ـ ع.چالاك ـ(١٥) بوو. ئەم نووسەرە لەساڵانی سییەوە بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامەی ژیندا دەبینرێ بەڵام هیچکام لەو بەرهەمانە وەك ئەونووسینەی گرنگ نەبوو کە ساڵی ـ ١٩٤٣ ـ لەژیندا بڵاوی کردەوە. هەژاندنو بزواندنێکی وەهای خستە کۆڕی ئەدەبی ئەو سەردەمەوە کە ماوەیەکی زۆر بە نووسینو باس کردن

لە ئارادا بوو. ئەمە چل‌و دوو ساڵ لەمەو پێش کە - ع.چالاك - نووسینی - هاوارژنینە -ی بڵاوکردەوە ویستی بەو نووسینە لە کۆمەڵی کوردەواری ئەو سەردەمەدا شۆڕشێکی کۆمەلایەتی بەرپا بکات. بەداخەوە لە بەر ئەوەی نووسەرو ڕەخنەگرەکانمان بە وردی تەماشای زۆر لە دیاردەو ڕوداوی ئەدەبی ئەو سەردەمەی ئەدەبی کوردیان نەکردوە گەلێ مەسەلەی وەها وەك خۆی ماوەتەوەو ڕێی تێ دەچێت بەڕابوردنی ڕۆژگار بیر بچێتەوە. لە کاتێکدا لە ئەدەبیاتی وڵاتانی پێشکەوتودا ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بایەخی خۆی هەیەو تەنانەت پارەیەکی زۆریش خەرج دەکرێت بۆ دۆزینەوەو ساخ کردنەوەوشی کردنەوەیان. چونکە باری ئەدەبی ئەمڕۆمان بەستراوە بە دیاردەو ڕوداوەکانی دوێنێ وەو ئەمڕۆش بەردی بناغەی سبەینێ دەبێت ئەو نووسینەی - ع.چالاك - بوە جێی باسی نەك ڕۆشن بیران بەڵکو خەڵکی بەگشتی‌و دوو بەرەی بۆ پێك هات. بەرەیەك بەڕاستیان زانی‌و هانیان دەدا، بەرەیەکی تریش بەربەرەکانێیان دەکردو بەلاوێکی سەرە ڕۆو بەرەلایان دەزانی. ئەو مەسەلە گرنگەی دیارە بە پێی ئەو ڕۆژگارەو چل‌و دو ساڵ لەمەو پێش کە (ع. چالاك) خستیە ناوکۆمەلانی خەڵکەوەو لە ڕۆژنامەی - ژین -دا سەرنجی نووسەرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بریتی بوو لە وتاری - هاوارژنینە - ئەم نووسینە لە پاش بڵاو بونەوەی لە ڕۆژنامەدا جگە لە کۆمەلانی خەڵکی نووسەرانی ڕاکێشا بۆ نووسین لەو بارەیەوەو پەیتا پەیتا ئەو نووسینانە بڵاو دەبوەوەو ئەو نووسەرانەش ئەمانە بوون‌و ناوی نووسینەکانیشیان دەنووسین.

١ - پیرە مێرد - بە سێ نووسین بەشداری کرد. بە ناوی - ئادابی مناظرە - نۆرەی ژینە - بەر لە ڕوو نەپۆشین -[١٦]

٢ - ئەحمەد هەردی بە وتاری - ڕوو پۆشین‌و نەپۆشین -[١٧]

٣ - نوری بابە عەلی بە وتاری - طرفداری حجاب.[١٨]

٤ - م. تاڵەبانی بە وتاری - سفورو حجاب -[١٩]

٥ - فاضل محمد بە وتاری ڕوو پۆش.[٢٠]

ئەمانە هەر یەك بە وتارێك‌و پیرە مێرو بە سیان ڕای خۆیان لەم بارەیەوە نووسی ئەو مەسەلە گرنگەش بە پێی ئەو ڕۆژگارە کە ئەم پێنج نووسەرە بەناوبانگەی ڕاکێشا بۆ نووسین مەسەلەیەکی کۆمەلایەتی بوو، لە ئەنجامی دوا کەوتوی کۆمەڵی کوردەواری ئەو سەردەمە ئەویش - پەچە - بوو، کە چۆن کارێکی وەها بکرێ ئەم دیاردە ناهەموارە لەناو ئافرەتانی کۆمەڵێ کوردەواریدا بەتایبەتی لە شارەکاندا فڕێ بدرێ‌و تەنانەت ئافرەت بتوانێ - سفور بێت. لەو ڕۆژگارە دا کەم کەس بە ئاشکراو بەنووسین دەی وێرا بەلای داوا کاریەکی وەها

دابچێت. بەڵام (ع. چالاك)ی نووسەرو ڕەخنەگر بە یاریدەی پیرەمێردی عاشقی خوێندن و پێشکەوتنی ئافرەتان ئەم مەسەلە گرنگەیان خستە ڕوو. هەر لەپاش بڵاوبونەوەی نووسینەکە دوا بەدوای یەك ئەوەوەوتارە و ئەو پێنج نووسەرە بەناوبانگەی ئەو کاتە کە ناومان بردن کەوتنە نووسین و وەڵام دانەوەی عبدالله جەوهەر. ئنجا پێش ئەوەی دەقی نووسینەکەی ع. چالاك ـ بنووسین با بزانین ئایا ئەو دیاردەیە ئەوەی دەهێنا وەها خەڵکی پێوە سەرگەرمی خەریك بکرێت ؟!. لە وەڵامدا دەڵێن ! ئەگەر ئێستا نووسەرێك بێت و وەك چل و دوو ساڵی لەمەوبەر باسی شتێکی وەها بکات ئەگەرچی بە ئوسلوبێکی نوێش بێت دیارە سەیرو سەمەرەیەو شایانی پێکەنینە. بەڵام لەو ڕۆژگارەدا ئەمە وەها نەبوەو لابردنی ئەم ڕواڵەتە لەناو کۆمەڵی ئافرەتاندا بە شۆڕش و کۆدێتایەکی کۆمەڵایەتی دادەنوا هەموو کەس لەباریانە بوو یاخود لەبەر دەسەڵاتی ئاینی ئەو کاتە نەیان دەوێرا توخنی بکەون. بەڵام لەئەدەبی کوردیدا هەمیشە کۆمەڵێك لەو شاعیرو نووسەرانە لە هەموو سەردەمێکدا هەبوون کە واقیعێکی تاڵ و دواکەوتوو نالەبار ڕەت بکەنەوەو ئازایانە بێنە پێشەوە، کوڕی سەردەمەکەی خۆیان بن. بۆ نموونە هەر لەو ڕۆژگارەدا لە زۆر موناسەبەی شیعردا باسی پەچەو فڕێ دانی پەچە کراوە. ئەمەش با هەندێ نمونە بێت لە نەخشی ئەو قەڵەمە بەهێزانە پیرە مێرد دەڵێت:

«پەچەت لادە لەڕوو، بنواڕە ڕۆژی حەشری حەسرەتکار
لە حەشرا ترسی ئاگر، لێرە شەوقی ئاگری ڕوخسار»

شێخ نوری شێخ صالح دەڵێن:
دای گرن توخوا فڕێی دەن بیخەنە تەندورەوە
حەیفە ڕۆژی ڕون ئەنێنە ناو شەوی دەیجورەوە

گۆران «مابوی بگاتە عاستم چەن هەنگاوێ
درزێ کەوتە پەچەو دیم نیگای چاوێ»

ئەخۆڵ «پەچەت لادە ببینم ڕوت ئەمن خۆ سەیری تۆ ناکەم
لە ڕوی تۆ تێ دەگەم یەزدان چلۆن نەخشی ئەنەخشێنێ»

بێکەس «هەستە تێکۆشە تاخوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕین دە چ وادەی شەرمە»

تەنانەت لەگۆرانی کوردی ئەو کاتەشدا ئەمە باس کراوەو - عەلی مەردان -[21] وگەلێ گۆرانی بێژی کە باسیان لێوە کردوە. گرنگی ئەم مەسەلەیەش تەنها لابردنی پەچە نەبووە بەڵکو بەسترابوو بە دوو شتی گرنگەوە، یەکەم داهاتنی - سفور -!!، دووەم سەربەست بوونی ئافرەت و شکاندنی چوارچێوەی ژیانی ماڵو هاتنە دەرەوەو کار کردن لە بوارەکانی ژیان‌دا لەتەك پیاودا. لێرەدا کاری ئەدەب لە کۆمەڵدا دەر دەکەوێت. ئەو نووسینەی - ع. چالاك - بوە راپەڕین و تەقینەوەیەکی کۆمەلایەتی و لەمەشدا نووسەر تووشی گەلێ قسەو هێرشی ناڕەوای نووسین هات بەلام کۆڵی نەداو دوای ئەومش بەناونیشانی تەتەلە - ەوە وتارێکی پڕ بایەخ تری نووسی و لاپەڕەیەکی گەشی نوێی بەوکارەی لە ئەدەبی کوردی‌دا تۆمار کرد ئنجا ئێستا دەقی وتاری - هاوارژنینە -ی عبدالله جەوهەر دەنووسین کە چل و دوو ساڵ بەسەریاد کردنەوەیدا تێ دەپەڕێ و سێ ساڵیش بەسەر مەرگی نووسەرەکەیدا. ئەو وتارەی ئەو شۆڕش هەژاندنە ئەدەبی و کۆمەلایەتیەی دروست کرد. ع. چالاك دەنووسێت «هاوار دایکینە، هاوار خوشکینە، هەموو ئەیزانین ژیان بەخۆشی و ترشی دڵەوە بەنکە. خۆشی دڵ گۆشە گیری دامانی یارەو ترشی دڵیش دووری دڵی یارە. خۆشتان ئەمە ئەزانن و لەو سەریەوە هاتو نەتەوە کە چی سەرەڕای ئەوەی بەزەییەکتان بە کەساسی پیاوانایەتەوە، هێندە دڵ ڕەقن، تروسکەیەکتان لە وڵیانا نەهێشتوتەوەو کردوتانە بەداوی دڵێ بێ سەرو سامانتانەوە خستوتانەتە تەوێڵ و سەرگەردانی لەڕێی بزەیەکی لێوی ئاڵتانا، تیلاییەکی گەشتانا، ئەمانە هەموی لەولاوە بوە ستێ هیچتان پیاوی نەکوشتوە. ئەو پارچە پەڕو ڕەشە ناهەموارەتان نەبێ ئەیدەن بەڕوی لالەزارتانا، نازانم چ خۆشیەکتان بەم پەلاسە ڕەشەدا چووە ؟! نازانم چ دڵێك پێ ی ئەکرێتەوە ؟!. چە دەرونێك ملی بۆ کە چ دەکات ؟!. پێم ناڵێن ئەم پەڕو ڕەشە کەڵکی چی‌یە ؟!. لام وایە ئەگەر هەموتان بکەونە سەر چاکەیەکی بۆ نادۆزنەوە هەرە گەورەترین بیانوشتان ئەمەیە کە دینی ئیسلامی فەرمانی پێ‌داوە بۆ پاراستنی حەیا لەمە زیاتر قسەیەکی ترتان نیە. بەلام توخواو توتافتەی خوارو تو زولفی خەیاتەی خاوتان تاوێك گوێ لە هەڵەشەو پەڵە شەی ئەم برایەتان شل کەن ئەوسا چۆنی بە چاك ئەزانن وەها بەر پەرچم بدەنەوە. توخوا خوشکینە ئەو ئافرەتەی خۆی دارای ناموس و حەیا بێ بە نەبونی پەچە بێ حەیاو چاولەدەر ئەبێ ؟!. ئەگەر دوریا لە خۆشیا خراپ بێ پەچە خراپەی ئەگێرێتەوە ؟!. ڕەنگە بڵێن ئەگەر ڕومان بەرەلا کەین هەتیو مەتیو بگرە هەموو پیاوی کوناو کون بە دوامانا ئەگەڕێن و ڕەفتاری خراپە لە ناو تەشەنە ئەکات. ئەوەی بەغدای دیبێ بۆ دەرئەکەوێ و بایەخ بەم قسەیەتان ناکات. چونکە هیچ ئافرەتێ نیە لە بەغدا دا بە

ڕووکراوەیی نەگەڕێو شان بەشانی گەنجەکان نەڕوا. کەچی لەو شوێنە تایبەتیانەدا نەبێ کە دانراون هیچ خراپەیەك ڕوو نادات. بەڵێ ڕاست ئەکەن یەکەمجار لە هەڵگرتنی ئەم پەچەیەدا چاو برکێ زۆر ئەبێ بەڵێ ئەبێ ببێ چونکە چە کچ چە کوڕ بەوە ڕا نەهاتوە. هەر خواخوای ئەمەی بووە لە درزی دەرگاوە لە پڕ ناکاو چاویان بەیەك بکەوێو بڵێسەی ئاگری دڵیان دابمرکێتەوە. بەلام بڕواش بەوە بکەن کە ئەم حاڵە بەردەوام نابێ، هێندە زوو ئەبڕێتەوە بە خەوی هیچ کەسێکدا نەیەت. لەلایەکی ترەوە ئەڵێن دینی ئیسلامی ئەمر بە پۆشینی پەچە ئەکا ؟! حاشا هەزار حاشا، خوشکینە بۆچی لادێیەکان کە سەوقاتی ئێوە ئەبن شان بەشانی گەنجەکان هەڵ ئەسووڕێنو دەرو دەشت ئەکەنو دینی ئیسلامی ڕێیان لێ ناگرێت ؟!. ئەی ڕێ لە ئێوە بۆ ئەگرێت ؟. خوشکینە ئەمجارە بە مەندە کۆتایم بەم گفتو گۆیە هێنا، دەسم دامێنتان بە دڵسۆزانە سەرنجێکی بدەنو بمکەنە نیشانگای تیرو توانجتان تا بە هەموومان تێ کەوینو لە ئەنجاما هەرە چاکترین ڕێگایەك بۆ لەناو بردنی پەچەبدۆزینەوە ئیتر خۆتانو خواتان». [22]

ئنجا پوختەی مەبەستەکانی نووسەر لەم خاڵانەدا دەر دەکەوێت:

١ ـ نووسینەکە تێکڕا بۆ لەناو بردنی پەچەیەو هاندانی ئافرەتە بۆ سەربەست بوونو کار کردن لەتەك پیاودا.

٢ ـ ئەوە دەسەلمێنێ کە پەچە نەریتێکی ڕەسەنی کوردەواری نیەو خواستراوە یاخود بەزۆر سەپێنراوە. ئەویش بە بەراورد لەگەڵ ئافرەتانی لادێدا کە پەچە بەکار ناهێنێ.

٣ ـ ئەم ڕەوشتە لە ئاینەوە دوورەو ئاینی ئیسلام بەکار هێنانی پەچەی بە پێویست دانەناوە.

٤ ـ ئەگەر ئافرەت ڕوی خۆی داپۆشیو پیاو نەی بینێ ئەوا کاری پەنهان و ڕەوشت خراپی لەناو کۆمەڵدا زۆر دەبێت لە لایەن هەردوو لاوە بۆ ئەوەی لە پشت ئاگای خەلکەوە ئەمان بەیەك بگەن.

٥ ـ ئەوە دەسەلمێنێ کە لابردنی پەچەو داهاتنی سفوور لە داهاتودا ـ هەروەك ڕوی‌دا ـ دەچەسپێو پەچە باوی نامێنێو ئافرەت سفور دەبێ. سنووری چوار دیواری ماڵ دەشکێنێو بۆ خوێندنو کارکردن لەتەك پیاودا دێتە پێشەوە. ئەمەش هیچ پەیوەندی بە بڵاوبونەوەی ڕەوشت خراپیەوە نیە.

سەبارەت بە ئەو حەوت نووسینەی دوای بڵاوبونەوەی وتارەکەی عبدالله جەوهەر ـ پێنج نووسەر بڵاویانکردەوە بڕیارم داوە لە داهاتودا لەتەك ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بیکەمە نامیلکەیەكو لەچاپی بدەم. چونکە لێرەدا ناکرێ ئەو وتارانە بنووسینەوە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١ ـ ڕەفیق حیلمی ـ ئەدیب و ڕەخنەگرو مامۆستایەکی شارەزا لە زمان و ئەدەبی کوردیدا. بەرگەکانی یاداشت و شیعرو ئەدەبیاتی کوردی و شیعرو نووسینەکانی جێگای تایبەتیان هەیە لە ئەدەبی کوردیدا. ساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە ساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردوە.
٢ ـ شیعرو ئەدەبیات «دوو بەرگە».
٣،٤ ـ پێشکەوتن ساڵی ١٩٥٨ دەرچووەو شەفەق لە ساڵی ١٩٥٨ دەرچوە
٥،٦ ـ ج ـ عبدالله جەوهەر بەم ناوەوە نووسینی زۆرە.
٧ ـ دلداری شاعیر ساڵی ١٩١٧ لە دایك بوەو ساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردوە.
٨ ـ بڕوانە یادگاری لاوان
٩ ـ قەل و ڕێوی ـ دلداری شاعیر بەشیعر کردویە بە کوردی.
١٠ ـ گەلاوێژ ژمارە (١) ساڵی ١٩٤٤.
١١ ـ گەلاوێژ ژمارە (٣) ساڵی ١٩٤٤.
١٢ ـ گەلاوێژ ژمارە (٦) ساڵی ١٩٤٤.
١٣ ـ عبدالله جەوهەر ساڵی ١٩٢٠ لەناوچەی قەرەداغ لە سلێمانی لەدایك بوە خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە سلێمانی بووە. بۆ خوێندنی زانکۆ چوتە بەغدا. ڕێکەوتی ١ ـ ٦ ـ ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردوە.
١٤ ـ ژین ژمارە (٧١٣) ساڵی ١٩٤٣.
١٥ ـ عبدالله جەوهەر بەم ناوانەوە نووسین بڵاوکردوتەوە (ع. چالاك، ع. جەوهەر، ع، ج، ع ج).
١٦ ـ ژین ٧١٥ ساڵی ١٩٤٣.
١٧،١٨،١٩،٢٠ ـ ئەو نوسینانە دوا بە دوای یەك لە ژمارە (٧١٥)ەوە بڵاوبوتەوە
٢١ ـ گۆرانی ـ کۆڵان بە کۆڵان جادە بەجادە

ئەشمیلەی چاو جوان پەچەکەت لادە.

٢٢ ـ ژین ژمارە ٧١٣ ساڵی ١٩٤٣.

# مامۆستا قەناتی کوردۆ . ش مەرگ ڕای دەپێچێ ....!

پاییزە ، دارو دەوەن ڕەنگ زەردە
باقەزوو و سەردە بەتۆز گەردە
دیارە لای شەختەیە ناخۆش خەوەرێ
دارە خۆی دەڕنێ ، خەزەل هەڵ دەوەرێ
هەورە ڕەشپۆش و بەگریەو ناڵە
سەرەتای شیوەنی مەرگی ساڵە

((......))

## ممتاز حیذری

ئەم ساڵ ، زدمێن لە سووڕانەوەی خۆیدا لەئاستی کەڵە ئەدیب و رۆشنبیرو زانایانی کورد لە بوومەلەرزەو بورکان و تەقینەوە دایە ، مەرگی ناوەخت دیاری و پاداشتە ...(!) بەلێ ، ناوە ناوە لە سووچێکی چوار گۆشەی کوردستان ، یا لە دەردەوەی نیشتمان ، لە پڕێکا بوومە لەرزەی نەفرەت لێکراو ، یان بورکانی سەدان ساڵ داخ لە دڵ ، ئەدیبێکی ناسراو ، رۆشنبیرێکی هەڵکەوتوو ، رۆژنامەنووسێکی لێهاتوو ، زانایەکی گەورە کەڵەمێردێکی ناودار قووت دەداو لە زەوی ستەمدیدەدا دەیانباتە خوارێ ...!

مەگەر هەر خۆی ئەم زەوی‌یە ستەمدیدەیە ، بزانێ ، ئەم ڕۆڵانەی بە چ ماڵ ویرانی‌و شار بەدەری‌و شەونخونی‌و بەژیانی کوێرەوەری پەروەردە بوون‌و تا قەڵەمە ناسك‌و خاوێنەکانیان ڕسکاون ، بونەتە مەشخەڵ‌و تێکۆشەر – ی ڕێگای پێش‌کەوتن‌و سەرفرازی‌ی وشەی ڕەسەنی نەتەوەیی کوردی بەتایبەتی ، ڕەوتی ئازادی‌ی کۆمەڵ‌و خاکی نیشتمان بەگشتی ...!

ئەوەتا زەمین ، ساڵێکی لە سوورانەوەی خۆیدا تەواو نەکردووە ، چەند ئەستێرەی گەش‌و پرشنگدار لەئاسمانی ئەدەب‌و زانست‌و ڕۆشنبیری کوردیدا چوونەتە خانەی هەرگیز نەمرانەوە ، وەك « ئالائەدین سجادی ، جگەرخوێن ، برهان قانع ، غازی فاتح وەیس‌و چەندی دیکەش ...» بەڵێ هەر لەم خوولەشدا ، لەسەرەتای مانگی گەلاڕێزاندا ، درەختێکی مەزنی کولتووری کوردی گوێزرایەوە بەهەشتی نەمری‌ی نەتەوەیی‌و مرۆڤایەتی ئەویش زانای کەم وێنـەی کورد : ئـەندامی کـارای کۆڕی زانیـاری کوردو سـەرۆکی بەشی کـوردی لەدەزگـای ڕۆژهەلاتناسی لێنینگراد پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ بوو ...!؟

● دەبێ ئەم کەڵەزانایە کێ بێ‌و چ هـەورازێکی ئێجگار دژواری بڕیوەو تا گەیشتۆتە لوتکە ؟! جا چ لوتکەیێك ؟!

بـەڵێ ، ئەو منـداڵە برزوك‌و ژیـرەی کورد ، لەخێـزانێکی هەژاری دەر بەدەری گوندی « سووسز» ی ناوچەی « قاقزمان »ی کوردستانی ناوەندی‌ی سەر دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانی و ساڵی ١٩٠٩ لەدایك بووە ...!

ساڵی ١٩١٨ تورکە عوسمانی‌یەکان ، بە سەر ئەرمەنی‌یەکان زاڵ بوون ، بنەماڵەی مامۆستا قەنـاتی کوردۆ لەدەست زوڵم‌و زۆرداری‌ی کـۆمەلایـەتی‌و نـەتەوەیی تـورکە عـوسمانی‌یـەکـان . خـۆیـان دەربـاز کـرد ، پێشـەکی لە ئەرمەنەستانی ڕووسیا نیشتەجێ بوون ... پاشدان لەساڵی ١٩٢٠دا ڕوویان لە شـاری تفلیس کـرد ... بـەلام لەم سـاڵەدا هێشتـا دەستـەلاتی سـۆڤێت دانەمەزرابوو ، ئەو بنەماڵە کـوردانەی لە ئـەنجامی سیـاسەتی تـورکەکـان رایـان‌کردبـوو ، لە گورجستـانی ڕووسیاش تـووشی جـۆرێکی دیکـەی زوڵم‌و زۆرداری بوون ، تەنانەت نانی ڕۆژانە بە دەرۆزە کردن‌و حەماڵی‌و بۆیاغچێتی پێیان دابین نەدەکرا ...!؟ تا لە ساڵی ١٩٢١دا بەتەواوەتی دام‌و دەزگای کرێکارو جووتیاران لەسەر تاپای وولاتی سوڤێتدا جێ‌گیر بوو ، جا نەك تەنیا مەسەلەی

پەیداکردنی رۆژانە دەستکرا بە چارەسەرکردنی ، بگرە مەسەلە هەرە گرنگەکە دابین کرا ، ئەویش ئازادی ی ولات و سەربەستی مرۆڤ بوو ...!
بەلام هەر لەو ساڵەدا ، واتا ١٩٢١ ، باوکی قەناتی کوردۆ مرد ...! بەمە قەناتی کوردۆ زیاتر تووشی چەرمەسەری ژیان هات ... تا بەرێکەوت رۆشنبیرێکی دلسۆزو مرۆڤ پەروەری ئەرمەنی بەنێوی «لازۆ» ئەوکۆمەڵە منداڵە کوردانەی لەبەر خویندن دانا ... یەکێك لەو قوتابی یانە قەناتی کوردۆ بوو ، واتە مامۆستا کوردۆ بە ـ ١٢ ـ ساڵی دەستی بە خوێندن کردووە ..! ئەوەی شایانی باسە ، هەموو رۆژێ پاش دەرسەکانی بەحەماڵی ، یان بۆیاغچێتی ی نانی رۆژانەی وەدەست دەهێنا ، تەنانەت پاش ئەوەی تەمەنی گەورەتر بوو ، دەستی بە رەنجبەری کرد ...! بە هەر حاڵ ـ ژیانەکەی زۆر دژوار بووە ـ، تا ساڵی ١٩٢٨ قوتابخانەی لازۆی تەواو کرد ... لە هەمان ساڵدا ، واتا ١٩٢٨ ، پاش ژانێکی زۆر قەناتی کوردۆ و چەند قوتابی یەکی دیکەی کورد لە [ کۆلێجی کرێکاران] وەردەگرێن ... لە ئەنجامی هۆشیاری و ژیری و شەونخونی قوتابی یەکان ، ئەم قوناغەیان لە ماوەی سێ ساڵدا ، واتا ساڵی ١٩٣١ بەسەرکەوتووانە بڕی .
مامۆستا کوردۆ . هێشتا لە کۆلێجی کرێکاران بوو ، دەستی بە نووسین کردو لە چالاکی یە هونەری یەکانی کۆلێجەکەدا بەگەرمی هاوبەشی دەکرد .... تەنانەت رۆژنامەیێکی دیواریشیان بەناوی « شاگردی کورد » بەزمانی کوردی دەرکرد ...!
لە ساڵی ١٩٣١دا ، لە زانکۆی لێنینگراد بەشی زانستی زمانەوانی وەرگیرا ... لەماوەی ئەو پێنج ساڵەی زانکۆی لێنیگراددا ، ئەم مادانەی دەخوێند : زمانی کوردی ، فارسی کۆن ، زمانی بلوژی ، زمانەکانی ئێرانی کۆن ، تیۆری زمانەوانی هتد ... تەنانەت لە ساڵی ١٩٣٤دا هێشتا قوتابی پۆلی سێ یەمی کۆلێجی زمانەوانی بوو ، کرا بە مامۆستای زمانی کوردی لە کۆلێجەکەی خۆی و کۆلێجی کرێکاران ....! تا ساڵی ١٩٣٨ بە پلەییێکی بەرز زانکۆی لێنینگرادی بەشی زانستی زمانەوانی تەواو کرد ...!
مامۆستا کوردۆ ، لە بەر ئەوەی بەدرێژایی ژیانی قوتابیەتی زیرەك و هەلکەوتوو بوو ، بۆیە پاش تەواو کردنی کۆلێجی زانستی زمانەوانی یەکسەر لەبەشی خوێندنی بالا ـ کاندێدات ـ وەرگیرا ..!

پاش بەرپابوونی دووەم شەڕی جیهانی بۆ ماوەی شەش مانگ لە دەورەیەکی تۆپچی ی خوێندی ، ساڵی ١٩٤٣ تا ١٩٤٥ وەك ئەفسەرێکی تۆپچی ی دژی فرۆکەکانی دوژمن دەجەنگا ...!

پاش برانەوەی دووەم جەنگی جیهانی ، مامۆستا کوردۆ لە کۆلێجی زانستی ی زمانەوانی سەر بە زانکۆی لێنینگراد زمانی کوردی بە قوتابیانی بەشی ئێرانی دەگوتەوە ... لەهەمان کاتیشدا کاریگەری [عامل ـ باحث] زانستی ی بەشی ئێرانی ئاموزگای رۆژهەلاتناسی ئەکادیمیەی زانستی ی سۆڤێت بوو لە لێنینگراد . لەساڵی ١٩٦٨ یش‌دا بڕوانامەی دوکتۆر علومی ـ دوکتۆر ناوك ـ وەرگرت .

لەسەرەتای شەستەکان‌دا ، پاش ئەوەی بەشی کوردی جیا کرابوەوە ، مامۆستا کوردۆ بەسەرۆکی بەشەکە هەڵبژێرا تا کۆچی دوایی کرد .

## پلەی زانستی‌و ناوەرۆکی بەرهەمەکانی

مرۆی دڵسۆزو مەزن ، ئەو کەسەیە ، کە بەهرەو تواناو بلیمەتیەکەی ، بەکارو کردەوەی سوود بەخش لە پێناوی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و زانستی تەرخان دەکات ، بەمە ئەو مرۆیە سەرمایەی هەرگیز نەمری هەتا هەتایێ مسۆگەر دەکات ، بەتایبەتی ئەگەر بێتۆ سەرەتای ژیانەکەی دۆڵی ژان و زێی خەم و ئازار بێ ، وەك سەرەتای ژیانەکەی مامۆستا کوردۆ کە بە پێچەوانەی دۆڵی ژان و زێی خەم و ئازار ، کارو کردەوەو بەرهەمە کۆمەلایەتی و ئەدەبی و رۆشنبیری و زانستی و نەتەوەیی یەکانی ، دەریایەکی روونی بێ بن بێ ، کە هەتا هەتایێ شینایی ژیانی ئەدەبی و کولتووری نەتەوەیی و مرۆڤایەتی شین‌تر دەکا ..؟!

بە پێی ئەو بەرهەمانەی کە لە ئەنجامی شەونخونی و لیهاتوویی و گیانی نەتەوەیی و هەروەها بەهۆی جۆری رژێمی ئەو وڵاتەی ، کە مامۆستا کوردۆ لە باوەشیا پەروەردە بووە ، هاتۆنەتە بەرهەم ، قەناتی کوردۆ نەك تەنیا بەزانایەکی

کوردی گەورەی وڵاتی سۆڤێت دەژمێردرێ . بەڵکو لە مەیدانی پسپۆری ی خۆیدا بە یەکێك لە زانا گەورەکانی جیهان دەژمێردرێ ..!

ئەوەتا لە ماوەی [٥٥] ساڵی ژیانی قوتابیو ماموستایەتیو نووسینو بڵاوکردنەوەدا ، واتا لەسەرەتای دەست بە نووسین کردنیدا ـ ١٩٣٠ ـ تا کۆچی دوایی نێزیکەی (١٠٠) سەد وتارو لێکۆڵینەوەی قووڵو فراوانو کتێبی بەنرخی دەربارەی زمانی کوردیو زانستی زمانەوانیو ئەدەبیو فۆلکلۆریو فەرهەنگ بەئاکام گەیاندووە ..! شایانی باسە هەندێ لەو بەرهەمانە بە دوو قۆڵی یان سێ قۆڵی لەگەڵ چەند زانایەکی کوردو سوڤیێتی بەئەنجام گەیاندووە ... ئەوەی زیاتر مایەی سەرنجو هەڵسەنگاندنە ، زۆربەی بەرهەمەکانی ماموستا کوردۆ ، لەلایەن زاناکانی وڵاتی سوڤێتو ئەوروپا پەسەندکراوە ..! وەك : « ئی . ئی تسوکەرمان ، دوکتۆر چ . خ بەکۆ ـ بەکاییف ـ دوکتۆر ئۆردوخانی جەلیل ، کوردناسی بەناو بانگی فەرەنسی رۆژێ لێسکۆ ، کوردناسی ناسراو تۆمابوا، ئابینینگسین هتد ...

هەمیسان شایانی باسە لەم رووەوە ، نابێ دەوری کاریگەری رژێمی سوشیالیستی راستەقینەو هەوڵو کۆششی مرۆڤ پەروەریو زانستانەی ( ئاکۆپ گازاریان ـ لازۆ، یوسف ئەبگارفیچ ئۆربێلی، عەرەبی شەمۆو چەندانی دیکە ، لەبارەی یارمەتی دانو پێگەیاندنی ماموستا قەناتی کوردۆ ، بەهیچ جۆری فەراموش بکرێن ..!

لە رووی ناوەرۆكو پلەی زانستی بەرهەمە گران بەهاکانی ماموستا کوردۆ ، منبەش بەحاڵی خۆم نەك توواناى ئەوەم نییە شییان بکەمەوە بگرە لێرەدا تەنانەت دەورکردنەوەیێکی هەڵسەنگاندنەیان زۆر زەحمەتە ئەوەی راستی بێ یەکێکی وەك ماموستا دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف بڵێ : ”لێ دوان لە کارە زانستەکانی ماموستا کوردۆ چەندین کتێبو ساڵی گەرەکە ...؟! ، ئەوەتا دوا بەرهەمی کە فەرهەنگی کوردی ـ رووسییە بە دوو قۆڵی لە گەڵ دکتۆر زارێ یوسف لە ساڵی ١٩٨٣ لەموسکۆ بەچاپیان گەیاندووە ، کارێکی مەزنە ، کە پسپۆری تایبەتی خۆی دەوێ تا لایەنی ناوەرۆکی زانستیو ئەدەبی هەڵبسەنگێنێ ... ئەم فەرهەنگە یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ رووسییە لە وڵاتی سوڤێتو هەندەران کە بەلێکسیکی زمانی ئەدەبیی هاوچەرخی کوردی

کوردستانیی خواروو لەسەر بناغەی لێکسیکی زاراوی [دیالێکتی] خوارووی زمانی کوردی « سۆرانی » تۆمار کراوە .

لەم فەرهەنگەدا نێزیکەی (٢٥) هەزار وشەی زمانی ئەدەبی کوردی تێدا هاتونەتە تۆمارکردن ... هەروەك دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ : « ئەم فەرهەنگە بەیەکێك لە فەرهەنگە بەرزەکانی کوردی دەژمێرێت و بەرهەمێکی گەورەی زانستییە لە کاری کوردناسیی سوڤیێتدا » .

بە کورتی ، بەکورتکراوەی کورتی ، کارو کردەوەو بەرهەمە زانستییە گەورەکانی مامۆستا قەناتی کوردۆ لەرووی خزمەت کردنی زمان و زانستی زمانەوانی ئەدەب و فۆلکلۆرو ئەتنوگرافیای کوردیدا فرە دەوڵەمەندن ، سەرەرای پێگەیاندنی دەیان قوتابی کوردو بیانی ... لەم چەند دێرەدا ، نەك تەنیا قەڵەمەکەم لەبارەی ناو بردیان شەرمەزار دەبێ ، بەڵکو دەورکردنەوەو هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەیان بەدەیان بگرە بەسەدان باسی فراوان و کتێبی زانستانە بەمافی رەوای خۆیان ناگەن ..! بۆیە کۆچکردنی ئەم کەڵە زانایەی کورد لە رووی مێژوویی و نەتەوەیی زمان و ئەدەب و رۆشنبیریی کورد بەزیانێکی رەسەنی نەتەوەیی دەژمێرێ ... هەردەم کەلێنە قووڵینە قووڵەکەی پڕ نابێتەوە ...!

## یادگارو ئاوات

لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٦ لە لێنینگراد بووم ، باسی ئەوەم کرد ، کە ئەم ساڵ (١٨٧٦ ـ ١٩٧٦) بیرەوەریی سەد ساڵەی لەدایك بوونی مەلای گەورە ـ مەلا محمدی کۆیی یە ـ مامۆستا کوردۆ بەم بۆنەیەوە کۆڕە ئێوارەیەکی بەرەسمی بەناوی بەشی کوردی سەر بەئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی لە لێنینگراد سازکرد.لە سەرەتای کۆڕەکەدا ، مامۆستا کوردۆ بەشێوەی کرمانجی خوارو وتارێکی بەنرخی دەربارەی مەلای گەورە لەگەڵ چەند پارچە هەڵبەستێکی خوێندەوە پاشدان هەندێك لە ئامادە بووانی کۆڕەکە وتاریان خوێندەوە .. شایانی

باسه ، وتارو گفتوگۆکانی کۆڕەکە بەشێوەیەکی رەسمی لە بەرهەمەکانی بەشی کوردی تۆمار کران ... لەوانەیە لە دوا رۆژدا بێنە چاپکردن .

ئەمە دەگێڕمەوە ، وەك بەڵگە لە هەڵوێستی نەتەوەیی و تووانای مامۆستا کوردۆدا لەڕووی فێربوونی شێوەی کرمانجی خواروو بەرەوانی هیچی ترنا ...

مامۆستا کوردۆ، مرۆیەکی مەزن و زۆر قسە ناسك و خۆش مەشرەب و سوحبەت چی بوو ... ئاواتێکی گەورەی ئەوە بوو ، کە سەردانی کوردستانی عیراق بکات ... بەلاّم بەداخەوە ئەم ئاواتە گیانی و نەتەوە پەروەری‌یەی لەگەڵ خۆی‌دا بردە ژێر خاکەوە ..!

هەزار و یەك حەیف و مخابن
هەزار و یەك چەپکە گوڵی ڕەنگین
بۆ گیانی پاکی ...!

## ● چەند نمونەیەك لە بەرهەمەکانی :

لێرەدا ، زۆر بەکورتی ناوی هەندێ لەبەرهەمەکانی تۆمار دەکەین ، بێ ئەوەی ناوی ئەو گۆڤارو رۆژنامانەو دەزگا زانستی و رۆشنبیری‌یەکان و سالّی چاپ کردنیان بێنین ، یان ناوی ئەو کەسانەی کە بدوو قۆڵی یان سێ قۆڵی لەگەڵ پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆدا هەندێ لەو بەرهەمانەیان بەئاکام گەیاندووە ، چونکە درێژی دادڕی هەڵناگری ..!

+ ئیزافە لە زمانی کوردیدا ...:
+ : نێرو مێ لەزمانی کوردیدا ...
+ : لەبارەی زمانی ئەدەبی کوردی ئەرمەنستانەوە ...
+ : چەند وشەیەك دەربارەی فەرهەنگی ئەرمەنی‌ی .. کوردی‌ی ..
+ : یاسای نووسین لە زمانی کوردیدا ..
+ : رەخنە لە « رێزمانی کوردی‌ی »
+ : لەبارەی پێشکەوتنی زمانی کوردی‌یەوە ..

+ : کتێبی ڕێزمانی کوردی ...
+ : چەند بەرهەمێکی فۆلکلۆری کوردی ...
+ : کوردی سۆڤێت لە ئەدەبی کوردی دەرەوەدا ...
+ : شێواندنی مێژووی کورد لە زانستی مێژووی بۆرجوازی فارسدا ..
+ : ڕەخنە لە بیروباوەری هەڵە بەرامبەر زمانی کوردی ..
+ : خ . ئابوڤیان وەکو کوردناسو ئەتنوگراف ...
+ : ڕێنووسی زمانی کوردی
+ : کورد ، « میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست »..
+ : زمانی کوردی ، « ئێرانی ئەمرۆ » ...
+ : ڕێزمانی زمانی کوردی
+ : درووست بوونی وشە لەزمانی کوردیدا
+ : سەرکەوتنی کوردناسی سۆڤێت
+ : دەربارەی دوو بنچینەی بوونی وشە لەزمانی کوردیدا ...
+ : کارەکانی پ لێرخ لەبارەی کوردناسییەوە ...
+ : ماناو فەرمانی پاشگری ـ ك (ەکە) لە زمانی کوردیدا ..
+ : فەرهەنگی کوردی (دیالێکتی کرمانجی ژووروو )...
+ : کوردناسی لە لێنینگراد ..
+ : ئەحمەدی خانیو بەرهەمی ئەدەبی ...
+ : مێژووی نووسینو لەچاپدانی فەرهەنگە کوردییەکان
+ : پەندی پێشینانی کوردی (پەندی پێشنیانو قسەی نەستەقی گەلانی ڕۆژهەڵات) ..
+ : مەمی ئایشی ـ داستانی ڕومانتیکی کوردی ، چیرۆكو گۆرانی داستانی کوردی .
+ : پێشگرو پاشگر لەزمانی کوردیدا فیلۆلۆژیای ئێرانی ...
+ : بیبلۆگراڤیای مێژووو فیلۆلۆژیاو ئەتنۆگرافیای کوردی ...
+ : بیروباوەری قارەمانییەتی لەبەرهەمی ئەدەبی ئەحمەدی خانیدا .
+ : شیکردنەوەی بەڵگەکانی کەزنەفۆن دەربارەی کاردوخەکان .
+ : بەرهەمی فۆلکلۆری کوردی
+ : فەرهەنگی کوردی ـ رووسی (سۆرانی) ١٩٨٣ .

## تێبینی :

لەسەر زانیاری‌یەکانی ناو ئەم وتارە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە :ـ

١ ـ رۆژی کوردستان ـ ژمارە ـ دوو تەمووزی ١٩٧١ ـ دوکتۆر مارف خەزنەدار .

٢ ـ پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ « کوردییێف » هەندێك بیروباوەڕ لە باوەڕی هەڵە لەبارەی زمان و مێژووی کوردەوە ، وەرگێڕانی دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف .

٣ ـ کاروان : ژمارە ١٧ هەواڵێکی مەزن ـ دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف .

٤ ـ فەرهەنگی کوردی ـ رووسی (سۆرانی) . کوردۆ د. زاری یوسف . مۆسکو ١٩٨٣ .

هەولێر

ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەمی

١٩٨٥

# داش بە داش و چەواشە کردن

محەمەد عەلی قەرەداغی

لە ژمارە (٢٦٧٦)ی رۆژی ٢١/١١/١٩٨٤ی (العراق)دا وتارێکم بە ناونیشانی « میرزا ئۆلقادرو هەڵسەنگاندنێك » نووسی . بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، واتە لە رۆژی ١٣/٢/١٩٨٤ی (العراق)دا مامۆستا محەمەدئەمین هەورامانی بە ناونیشانی « هەڵسەنگاندنی هەڵسەنگاندنەکەی مامۆستاقەرەداخی » وەڵامی وتارەکەی دامەوە .

لە وتارەکەی مامۆستا هەورامانیدا هەندێك لە ڕێگەلادان و لەبابەت دوورکەوتنەوەو چاوبەستکردن لە خوێنەرانم دیو ، سەرەڕای ئەوانەیش هەندێك تەشەرو قسەی نارەوای نووسیبوو . بۆیە وتارێکم بە ناونیشانی « جارێکی دیکەیش لەگەڵ میرزا ئولقادردا بەلام بێ هەڵچوون » نووسیو ، بۆ ئەم گۆڤارەم ناردو ، بە هیوام رۆشنایی ببینێ و لەسەر لاپەڕەکانی جێگەی خۆی بگرێ .

لەم رۆژانەدا کە ژمارە (٣)ی ئەم گۆڤارە ـ نووسەری کورد ـ کەوتە بازارەوە . زۆر جێگەی سەرسوڕمانی منو ، بگرە زۆربەی خوێنەرانیش بوو ، کە جارێکی دیکە هەمان وتاری بە هەندێ جنێوو تۆمەت بۆ ئەمو ئەوو ، بگرە بۆ ئەم دەزگاو ئەو دەزگایشەوە گرتبوە خۆی !

لێرەدا منو ـ بگرە خوێنەرانی ئەم گۆڤارەیش ـ ماف ئەو گلەیی یەمان لە مامۆستایان و برایانی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە هەیە کە بڵێین : خۆتان باش دەزانن دەیانو ، بگرە صەدان ، وتاری باش لە فایلەکانتاندا رز کراون و چاوەڕێتی سەرەن کە رۆژێك لە رۆژان بڵاو بکرێنەوە ، ئا لەم کاتەدا بۆ دەبێ

وتارێکی نامەوزووعی بۆ جاری دووەم لە گۆڤـارەکەدا بـڵاو بکەنـەوەو (١٥)! لاپەڕەی پێ ڕەش‌بکەنـەوە ، کە دەکـرا لەو ئەنـدازەدا دوو سێ وتاری بـاش بڵاوبکەنەوە(*)؟!

ئەم وتارەی مامۆستا هەورامانی ـ وەك لە بڵاوکردنەوەی دووەمی‌یـەوە دەردەکەوێت ـ لە جاری یەکەمدا دەستێکی شارەزا دۆستانە بۆی دەسکاریی کردەوەو ، گەلێ قسەی ناڕەواو ، تۆمەت بـۆ ئەمو ئـەوی لێ لابردوە ، بـەلام مامۆستا هەورامانی بەو کارە قایل نەبوەو ، جارێکی دیکە وتارەکەی داوەتەوە بە بڵاوکردنەوە .

ئەوەی راستیی بێت بەهیچ جۆر ئارەزووی ئەوەم نەبوە کە جارێکی دیکە لەم بابەتە بنووسمو، کاتی خۆمو خوێنەرو دەرفەتی گۆڤاری پێوە بگرم ، بەلام وتارەکەی مامۆستا هەورامانی بە جۆرێك راستیی شێواندوە ـ بە هیوایشم ئەوانە هەموو هەڵە بن‌و بە ئارەزووکاری وای نەکردبێ ـ بێ‌دەنگ بوون لە عـاستیدا دەبێتـە هۆی ئـەوەی چەنـد هەڵەی گـەورە لە مێـژووی ئـەدەبی کـوردیـدا بچەسپێیت . بۆیە ـ بە ناچاریی ـ لە عاستیی (هەندێك) لەو قسەو باسـانەدا دەوەستمو ، بە کورتی وەلامیان دەدەمەوەو ، هێمنانەو لەگەڵ بەڵگەدا رووی راستیی دەردەخەمو ، ئەوەیش دەڵێم : شێوەی پەروەردەبوونمو رێبازم رێگەی ئەوەم نادەن وەلامی قسە ناشیرینەکانی بدەمەوە .

مامۆستا هەورامانی لە ل : (١٥) دەڵێ :

**« بە شێوەیـەکی روونتر ، لە تـوانادا هـەیە بێـژین بە هـۆی لە بێژنگدانی سـەرپاکی هـەڵسەنگـاندنـەکانی ـ هـەر لەو هەڵسـەنگادنـە رەشبینی‌یەی کە لە بارەی بەرهەمەکەی عوسمان هەورامی‌یەوە بڵاوی کردەوە تا دەگاتە ئەوەی خلیل مونەوەرو ئەوەی (میرزا ئۆلقادریش) جگە لە تاکە مەبەستێکی تایبەتی خۆیی نەبێ هیچ جۆرە مۆرکێکیان پێوە دیار نییە ئەویش ئەو پەردە رەشەیە کە بەرچاوی چاوێلکەی هەڵسەنگاندنی کاك حەمە عەلی گرتووەتەوە ...»**

پێش وەلامـدانەوەیـەکی کورتی ئـەم قسە دەڵێم : رێبـازی نـووسینی زانستی‌یانە داوا لە مامۆستا هەورامانی دەکا کە خوێنەر چەواشەو سەرگەردان

نەكات . ئەو كە باسی (وتاریكی) من دەربارەی (بەرهەمەكەی) عوسمان هەورامی دەكات نابێ بە خوێنەر بلێت ئەو وتارە بە چ ناونیشانێك نووسراوە ؟ كەی و چ ساڵێك نووسراوە ؟ لە چ گۆڤارو رۆژنامەیەكدا بڵاوبوەتەوە ؟ ئەوا من ـ لە بەر ئەوەی وتارەكە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە ـ رەنگە بزانم لە كوێدا بڵاوكراوەتەوە ، ئەی خوێنەر چووزانێ وتارێك پێش دە ساڵ بڵاوبووبێتەوە لە كوێدا بڵاو بوەتەوە ؟ یان بۆ ئەبێ ئەو ئەركە بخرێتە ئەستۆی كە تەماشای گۆڤارو رۆژنامە كوردی‌یەكان بە تەواویی بكات تا شتێ بەشتێ بكات ؟ یان خوێنەر چووزانێ من دەربارەی كام بەرهەمی عوسمان هەورامی نووسیومە ؟ عوسمان هەورامی دەیان بەرهەمی لە گۆڤارو رۆژنامەكاندا بڵاوكردوەتەوە ! بۆیە پێویست بوو مامۆستا هەورامانی ناوی بەرهەمەكەی مامۆستا عوسمانی ببردایەو ، ناوو كات و شوێنی بڵاوكردنەوەی وتارەكەی منیشی بنووسیایە .

دوای ئەمەیش دەڵێم : نووسەر ، یان هەركەسێك كە قسەیەكی یەكێكی بە دڵ نەبوو ، ئیتر نابێ دنیای لێ تاریك ببێ‌و ، بۆ سووككردنی بەرانبەرەكەی‌و سەلماندنی قسەی خۆی راستیی پێشێل بكاو ، چی بە خەیاڵیدا بێت بی‌لێ‌و بی‌نووسێ . دەڵێم : كاتێك ئەو وتارەی من لە ژمارە (٣٢٤)ی رۆژی ١٩٧٦/٧/١ی (هاوكاری)دا بە ناونیشانی ئەنجامی پەلەكردن لە چاپكردنی دیوانی وەلی دێوانەدا ، دەرچوو مامۆستا هەورامانی پیرۆزبایی لێكردم‌و وتی : شتێكی وردو راستت نووسیوەو، هەندێ قسەی دیكەیشی كرد ، كە من نایانكەم . رەنگە خوێنەر دوودڵی‌یەكی لەم قسەیە هەبێت‌و بلێت : بۆ سەپاندنی قسەی خۆت وا دەڵێیت ! بەلام من بەڵگەی ئەم مەبەستە لە نووسراو (نەك قسەی دەمی)ی مامۆستا هەورامانی خۆی دێنمەوە . مامۆستا هەورامانی دوابەدوای وتارەكەی من لە گۆڤاری (رۆشنبیری‌نوێ)[1]دا دەربارەی (وەلی دێوانە)كەی مامۆستا عوسمان هەورامی نووسی‌و ، بەم جۆرە دەستی پێ‌كردوە .

**« لە هاوكاری ژمارە ٣٢٤ی ١٩٧٦/٧/١دا مامۆستا محەمەد عەلی قەرداخی بە ناوونیشانی « ئەنجامی » پەلەكردن لە چاپكردنی دیوانی وەلی دێوانە »دا هەندێ رەخنەی (بەجێ‌ی) لە كتێبەكەی مامۆستا عوسمان هەورامی (وەلی دێوانە) گرتبوو . منیش لەگەڵ زوربەیان دامو ...»**

تەنها ئەوەندە لە مامۆستا هەورامانی دەپرسین : بۆ ئەو کاتە رەخنەکان (بەجێ) بوون و ئێستە رەش‌بینانەن ؟ بۆ ئەو کاتە پەردەی رەش سەر چاوێلکەی نەگرتبوو, و ئێستە ئەیگرێ ؟ خۆ وتارەکەیش جارێکی دیکە بلاونەکراوەتەوە تا دەستکاریی کرابێ .

● مامۆستا هەورامانی لە ل : (١٨)دا دوای کۆمەڵێك قسەی نارەوا دەڵێت : « وێنەشمان ، بۆئەو وتەیەمان ، بلاوکردنەوەی هەندێ شیعری نالەباربوون کە (لەلاپەرە ـ ١٩٢ ـ تا ـ ٢١٣)ی بەرگی دووەمی کەلەپووری ئەدەبی کوردی‌دا بلاوبووبوونەتەوەو بوبوون بە هۆی بەرپاکردنی ئاژاوەیێ لە نێوان کوردیی کاکەیی‌و کوردیی ئیسلام‌داو لەوانەش بوو ؛ تەشەنە بسێنیی‌و ببێ بە هۆی خستنەوەی دووبەرەکی‌یەوە ئەگەر دلسۆزی هەردوو لا ، نەکەوتنایەتە ناو نێوانیانەوە .»

ئەوە لە خوێنەرانی کورد ئاشکرایە کە مامۆستا هەورامانی بە نووسینی کتێبی (کاکەیی) هەندێك دڵی بەرەی کاکەیی لە خۆی رەنجاندووە، تا ئێستا گەلێ قسەو باس لەسەر کتێبەکەی کراوەو، چەند وتاری لەسەر بلاوکراوەتەوەو[٢] ، لەوانەیە زیاتریشی لەسەر بنووسرێ. جا منٍ وا هەست پێ‌دەکەم کە مامۆستا هەورامانی بەم قسەی ئێرەیە دەیەوێ تۆزێك باری سەرشانی خۆی سووك بکات‌و، بەڵکو سا هەرچۆن ببێ کارێکی وا بکات کاکەیی‌یەکان نەختێك رووی قەڵەمیان لە ووەربچەرخێنن‌و بابدەنەوە بە لای مندا ، بۆئەم مەبەستەیش پەنای بردوەتە بەر ئەم قسە کە خۆی دروستی کردوە ، ئەوەیش بەڵگەی روون هەر لەناو دێرەکانی مامۆستا خۆیەوە :

مامۆستا هەورامانی ـ وەك لەمەولا باسی دەکەین ـ خۆی دەڵێت : کاتی لەچاپدانی بەرگی دوەمی (کەشکۆلی کەلەپووری ئەدەبی کوردی) ئەو ـ واتە مامۆستا هەورامانی ـ بەرپرسی بەشی رۆشنبیریی دەزگای رۆشنبیری کوردی بوەو ، ئەم کتێبەی بە داش‌بەداش بۆ چاپ کردووم . بۆیە دوو پرسیار لە مامۆستای هەورامانی دەکەم :

کە جەنابتان بەرپرسیاری بەشی رۆشنبیری بوون‌و ، خۆیشت دەڵێی ئەو ئەندازەی کتێبەکە (شیعری نالەبار) بوو بۆچی رێگەت دا بلاوببێتەوە ؟ ئایا لە لێپرسینەوە نەدەترسایت کە سووچێکی ئەو ئاژاوە بەرپابوە تۆیش بگرێتەوە ؟ با

بلێین ڕەنگە بلێت ـ هەرچەند بۆ بەرپرسیار شتی وایش نابێت ـ: من ئاگام لەو شتە نەبوەو بەسەرما تێپەڕیوە . ئەی :

نەدەبوو خوێنەر لە کاتو شوێنی ئەو ئاژاوە بەرپابوە ئاگادار بکەیت کە لەوانە بوە دووبەرەکی بخاتە نێوان موسوڵمانو کاکەیی‌وە ؟ ئەوەی من بزانم تا ئێستە (یەك!) کاکەییش دەربارەی ئەم باسە قسەیەکیان لە رووی مندا (کە مەلایەکی موسوڵمانم) نەکردوە ، چ جای نووسینو بڵاوکردنەوە . تەنها کەسێکیش لەم باسە دوابێ مامۆستا عوسمان هەورامی[٣] بوو ، ئەویش موسوڵمانەو، لە روانگەی باسەکەی، مامۆستا هەورامانیشەوە قسەی نەکردوەو، منیش وەڵامم داوەتەوە .[٤] جا ئەگەر مامۆستا هەورامانی شتێ بزانێو لە ئێمەی شاردبێتەوە ئەوە شتێکی دیکەیە .

● لە دوای ئەم قسانەیشەوە مامۆستا هەورامانی سەرگوزەشتەیەکی دوورو درێژ دروست دەکاتو ، لە وتاری پێشوودا وەڵامی بەشی زۆریم داوەتەوە ، بەڵام هەندێك قسەو تۆمەتی زیاد لێرەدا هاتوونەتە گۆڕێو ، لێبێدەنگبوونیان کارێکی شیاو نیە . پوختەی سەرگوزەشتەکەیشی ئەوەیە کە عەسرانێك هاتوە بۆ ماڵی ئێمەو ، داوای یارمەتی لێکردووم بۆ بەرهەمی میرزا ئۆلقادرو ، گوایە داش‌بەداشی لەگەڵ کردوومو من ویستوومە بەرگی دوەمی کەشکۆڵم ـ بەو هۆیەوە کە ئەو بەرپرسیاری بەشی رۆشنبیرییە ـ بۆ چاپ بکاتو منیش یارمەتی بدەم . دواییش دەڵێت :

**«وەڵامی من بۆ ئەم داوایەی مامۆستا ، هەرتەنها ئەوە بوو ، کە ئەو لە ساڵێکدا هەققی لە چاپدانی یەك بەرهەمی هەیەو تا ساڵێکیش بەسەر ، بەرهەمی پێشووی‌دا تێ نەپەڕێ ، مافی ئەوەی نییە کە بەرگێکی تری بۆ لەچاپ بدرێ (بەپێی یاسای دەزگاکە) ...» ل : ١٨ .**

مامۆستا هەورامانی لە کۆتایی ئەم سەرگوزەستەوە دەنووسێ :

**«پەیماندانی مامۆستاو پووچکردنەوەی هەمان پەیمانی لە لای خۆیەوەو سوێندخواردنی (لە ماڵەوە) کە ... بێگومان بڕوای خوێنەر دەخاتە گێژاوەوەو هەروەها واشی لە من کردووە ، کە ناوبەناو بە شریتی ڤیدیۆتێپی سەرگوزەشتەکەدا بڕۆمەوە نەوەکو هەڵەیەکی تێدابێو دیسان لەوە دڵنیا دەبمەوە کە من زۆر راست دەکەم ناهەقق لەگەڵ ئەودایە»**

که ماموّستا هەورامانی ئەوەندە بە پشتەسووری ئەم سەرگوزەشتە بگێڕێتەوەو پشتیش بە ڤیدیوتێپ ببەستێ گومانی ئەوە کەم دەبێتەوە کە هەڵەی تێداکردبێت ، بۆیە بوونی هەڵەیەکی زەقی مێژوویی کە ڕێگەی چارەسەرو پینەکردنی نەبێ گێڕانەوەکەی ماموّستا بێبایەخ دەکاتو ، سەرلەبەری سەرگوزەشتەکەی هەڵەوگێڕاو قلّپ دەکاتەوە .

ماموّستا کە دەڵێ : «وەلامی من بۆ ئەم داوایەی ماموّستا ...» وا پیشان دەدات کە پێش بەرگی دوەمی کەشکۆڵەکە (بەرگێکی تری) لە هەمان دەزگاولەو ساڵەدا چاپکرابێت . بۆیە ئەو مەگەر لەبەر خاتری (داشبەداش) (شق القمر) بکات ئەوسا ئەو بەرگەم بۆ چاپ بکرێت . بەلام سەرانسەری ئەم قسەیە نادروستو بێجێیە ؛ چونکە نەك ساڵی دوو کتێب ، بەڵکو ئەوەتەی دەزگای رۆشنبیری کوردی هەیەو من شت دەنووسم (بە شێوەی کتێب) تەنها (دیوانی جەفایی) ساڵی ١٩٨٠ و (بەرگی دووەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی) ساڵی ١٩٨٢ بۆ چاپکردووم . بەلام بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەم لە چاپخانەی (الحوادث) بە یارمەتییەکی (سولفە)ی کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کوردی) و ساڵی ١٩٨٠ لەچاپ دراوە .

واتە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکەی ماموّستا هەورامانی (تەنها لەم خاڵەدا) دوو شتی نادروستی تێدایە :

یەکەم : ئەو دەزگایە لەو ساڵەدا هیچ کتێبێکی دیکەی ـ نە بە یارمەتیدانو نە لەسەر ئەرکی خۆی ـ بۆ من چاپ نەکردوە .

دوەم : بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە لە ساڵی ١٩٨٠دا ، واتە دوو ساڵ پێش بەرگی دوەمی ئەو کتێبە ، چاپکراوە . ئیتر بۆ ماموّستا هەورامانی خوێنەر ناخاتە گێژاوەو هەقق ! بەلای ئەوەوە بێ نەك من ؟ !

پرسیارێکی دیکەیش ئاراستەی ماموّستا هەورامانی دەکەم : ئایا چۆن دەگونجێ پیاوێکی رۆشنبیرکە بەرپرسیاریی بەشی رۆشنبیری دەزگایەکی گشتیی پێ بسپێررێو ، ئامادەیی خۆی بۆ ئەوە دەربخا کە لە پێناوی مەبەستێکی بچووکی خۆیدا (داشبەداش) بکاو ، بەرژەوەندیی دەزگاکە بخاتە ئەولاوە ؟ !

● بەوەندە دەسبەرداری ئەم خاڵە ـ هەرچەند زیاتری دەوێتو منیش زۆرترم لایە ـ دەبمو لاپەڕە هەڵدەدەمەوەو دەڕۆم تا لە (٢٦)دا لووتم بە لووتی تەشەرو توانجێکی ناڕەوادا دەتەقێت ، کە ماموّستا هەورامانی دەڵێ :

**«نەوتراوەو ناوترێ ـ جگە لەوانەی کە رۆشنبیرییەکەیان هەر لە بنەڕەتەوە عەرەبی بوەو لەم ئاخرە ئۆخرەدا لایـان بە لای رۆشنبیـریی کوردیدا کردوو ـ لە ژێر ناوی شاهۆدا ناونراوە ! »!!**

لەبەر ئەوەیش ئەمەم هەڵنەبژارد کە تەشەرو توانجی ناڕەوای تێدایە ؛ چونکە تەشەر لەوە زۆرتـرە وەلام بدرێتـەوە ، بەلام بـەر ئەوە کـە لە پەنـای تەشەرەکەدا هەڵەیەکی گەورەی مێـژوویشی کردوەو زیـاتر خـۆی لە (هەقق) دوورخستۆتەوە . چونکە من بە مامۆستا هەورامانی دەڵێم : نکوولیم لەوە نیە کە رۆشنبیری عەرەبیم هەیەو ، شانازیش بەوەوە دەکەم کە قەڵەمەکەم لەم رووەوە دووسەرەو، دەتوانم شانبەشانی نووسینی کوردی بە عەرەبیش بنووسمو ؛ لە هەردوو لایشدا لە هاوشانی خۆم کەمم نـەبێ . بەلام ئـەوە ـ بەبـەڵگە ـ بـۆ مامۆستا هەورامانی روون‌دەکەمەوە کە لە کـاتێکەوە بیـرمکردوتـەوەو دەستم قەڵەمی گرتوە شەیدای زمانی زکماکی خۆم بوومو ، ئاواتم ئەوە بوە بتوانم بە هەر شێوەیەك بێت خزمەتی بکەمو ، یەکەمجار کە دەستم داوەتە نـووسینو شتم بڵاوکردوەتەوە بە زمانی کوردی بوەو ، یەکەم نووسینم بەرگی یەکەمی (إقتران النيرين في مجمع البحرين)ەکەی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابانـە کە سـاڵی (١٩٧٣) چـاپکراوەو ، نـووسراوو بـڵاوکراوەی شتی دیکـەی کوردیشم دە چەندانی نووسینی عەرەبیمە . جا ئەگەر مامۆستـا هەورامـانی شتێکی دیکە بزانێ کە من (خۆم) نەیزانمو، ئەو مێژووی (لاکردنەوەمی بەلای رۆشنبیـریی کوردیدا) تۆمار کردبێ ئەوەیش شتێکی دیکەیە .

- مامۆستا هەورامانی لە نووسینەکەیدا بەوەوە نەوەستاوە کە رووی تـۆمەتو تـاوانبارکـردن بکاتـە منو بەس . بـەڵکو دەزگـا کوردییـەکـانیشی تێوەتلاندوەو ، ئەوانیش لە دەمی رزگار نەبوون ، دوو لاپەڕەی دوایی وتارەکەی ئەم لایەنە بەزەقی دەگرنەوەو من ـ لە بەر کورتکردنەوەو کـەم جێگە گـرتن ـ لاپـەڕەیەکیـان دەبوێـرمو تۆزێـك دەربارەی دوا لاپـەڕە دەدوێم . مامـۆستـا هەورامانی دەڵێ :

**« ناشوکریی نەبێ رۆشنبیرە هەورامیزانە ئەدەبـدۆستەکـان زۆر کەمنو ئەتوانین بڵێین ، کە لە شێخ ئەمین نەقشبـەندیو حـەمەکـەریم**

**هەورامی و عوسمان هەورامی بەولاوە هێشتا کەسی دیکە سەری هەڵنەداوە.**

**لەلایەن دەزگا رۆشنبیری یە کوردی یەکانیشەوە ، هەر بۆ سوودی گشتیی و سوودی خۆشیان ، زۆر کەم بیریان لەو کورد واتەنیە کوردی یە کردووەتەوە ، کە دەڵێ : (نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب) زوربەی وەخت لەو رووەوە کەوتوونەتە دوای رازەکوردەواریەکان ، کە ئەوەی بۆ ئەم شیاوە لەبەر ئەوەدا دانراوە کە بۆی نەشیاوە ، بێگومان ، کردەوەی وەها جێگەی لۆمەیە »!!**

ئەوە ڕوونە کە ئەم وتەیە لەبابەت لادان و لە مەبەست دوورکەوتنەوەیەکی بێمەبەستەو ، نەدەبوو شتی وا رووبدات ، جگە لەوەیش پەیوەندی یەکی زۆری بە منەوە نیە ، وەك ئەوەی گەلێ کەس و دەزگا دەگرێتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە وەڵامی وتاری مندا هاتوەتە کایەوەو ، منیش وەڵام دەدەمەوە ، هەندێ شتیش دەربارەی ئەم لایەنە دەزانم ... وای بە باش دەزانم هەندێکی لەسەر بدوێم .

لەگەڵ ڕێزمدا بۆ مامۆستایان : ئەمین نەقشبەندی و ، عوسمان و حەمەکەریم هەورامی ، من ئەوە ناسەلمێنم کە دەزگا کوردی یەکان نووسراوی هەورامی - لەبەر ئەوە کە هەورامی یە - بدەنە دواوەو چاپی نەکەن و ، مامۆستا هەورامانیش ، بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی بەرێتە سەر دەبوو لە پاڵ داوایەکی وا گەورەدا ئەوەی روون بگردایەتەوە کە ئەم هەورامی زانانە تا ئێستە چەند کتێبی باشیان بۆ ئەو دەزگایانە بردوەو ئەوان دەرگایان لە روویاندا کولۆم کردوەو یارمەتی یان نەداون ؟ یان هیچ نەبێ ناوی دوو سێ کتێبی لەوانە بنووسیایە .

لە لایەکی دیکەوە من بەش بە حاڵی خۆم ناسراویم لەگەڵ مامۆستا ئەمین نەقشبەندی هەیەو ، گەلێ جاریش پێکەوە دانیشتووین و قسەو باس کراوە کەچی هێشتا رۆژێ لە رۆژان لێم نەبیستوە کە بڵێت : شتێکم بردوە بۆ فلان دەزگای کوردی و داوایانە تەدواوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەزگاکان خۆیان داوای شتی لێ دەکەن و ، نووسراوی ئەو دواناخەن .

وەك بەڵگەیەکی دیکەیش من لە عاستی خۆمەوە - هەرچەند لای مامۆستا هەورامانی هەورامی زان نیم نەبوەو نابێ هەورامی زان بم - تا ئێستە دەیان

بەرهەمی هەورامیم بۆ ئەو دەزگایانە ناردوەو رۆژێك لە رۆژان بەرهەمێکم لەبەر ئەوەی کە بە هەورامی گوتراوەو نووسراوە .. نەدراوەتە دواوە .

ئەو پرسیارەیش لە مامۆستا دەکەم : کە ئەو بەو جۆرە دڵی بە ئەدەبی بەهەورامینووسراو دەسووتێ لەو کاتەدا کە خۆی بەرپرسیاری بەشی رۆشنبیریی دەزگای رۆشنبیری بوو بۆچی لایەکی بە لای بەرهەمی هەڵچنراوو ریزکراوی ئەو هەورامیزانانەدا نەکردەوە ، کە خۆی بە هەورامیزانیان دەزانێ ؟! دیارە خۆیشی لەم روەوە لە لۆمە رزگار نابێ .

پرسیارێکی دیکەیش ماوە : کە وەك ئەو دەڵێ جگە لەو سێ کەسە هێشتا (کەسی دیکە - واتە هەورامیزان - سەری هەڵنەداوە) ... ئەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی خاوەنی دیوانی مەولەویو ، کاك محەمەدی کوڕی کە (شیرینو خوسرەو)ی بلاوکردوتەوەو ، کاك فاتیحی برای کاکەحەمە کە ئەرکی زۆری فەقێ قادری هەمەوەندی بە ئەستۆوە ، بوەو ، خوا لێخۆش بوو مامۆستا کاردۆخی کە ئەم خۆی (لەیلێو مەجنوون)ەکەیی بلاوکردەوەو ، نێکرەفتاری لەمەڕ بێسارانیو .. دەیان کەسی دیکە بە چی دەزانێ ؟ بۆ تا ئێستە پەساپۆرتی هەورامی نووسینی لێ نەسەندوونەتەوە ؟!

---

خوێنەری ئازیز ! لەگەڵ داوای لێبوردندا لە تۆی ئازیز بەم ئەندازە دەسبەردار دەبمو ، کورد دەڵێ : « مشتێ نموونەی خەراورێکە » و . وا بزانم لەوەدا کە نووسیم بەڵگەی روونی ئەوەم پیشانداوە کە مامۆستا هەورامانی لەبەر ئەوەی سەرنجە پێشوەکانی من وەرنەگرێو نەیانسەلمێنێ پەنای بردوەتە بەر ئەو شێوە نووسینە کە لە راستیدا نە خزمەتی خۆیو نەخزمەتی ئەدەب دەکات . دەبا هەموو مەبەستمان خزمەتی راستییو ئەدەبو زمانی کوردی بێتو سەرنجو رەخنەی یەکتر بە سنگی فراوانەوە وەربگرین .

١٩٨٥/١٢/٢٠

## سەرچاوەو بەراوێزەکان :

(١) ـ بڕوانە : محمد أمین غفور ، جارێکی تر لەگەڵ دیوانەکەی وەلی دێوانە . گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ژمارە : ٥٤ . ساڵی ١٩٧٦

(٢) ـ بڕوانە : هاشم کاکەیی و ، هەردەوێڵ کەکەیی ، ڕۆشنایی یەك بۆ مێژوو . گۆڤاری کاروان ، ژمارە : (٢٨) ساڵی ١٩٨٥ .

(٣) ـ بڕوانە : عوسمان هەورامی ، پیاچوونەوەیەك بە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی‌دا (بەرگی دوەم) گۆڤاری کاروان ، ژمارە : ١٢ ، ئەیلوولی ١٩٨٣ .

منیش دوابەدوای ئەمە وەڵامی کاك عوسمانم دایەوە باسەکە بە خۆشی و دۆستانە کۆتایی هات .

(٤) ـ بڕوانە : محەمەد عەلی قەرەداغی ، سەرنجدانێکی پیاچوونەوەکەی کاك عوسمان هەورامی بە بەرگی دووەمی « کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی »دا . گۆڤاری کاروان ، ژمارە : ١٦ی کانوونی دوەمی ساڵی دوەم ١٩٨٣ .

(*) ـ وەکو چۆن مامۆستا محمد علی قەرەداغی وەڵامەکەی مامۆستا محمد امین هەورامانی بە نامەوزوعی و ... هتد دەزانێ ، بێگومانە کە ئەویش ئەمەی بەم هەروا دەزانێت ، ئەم نووسینانە رای نووسەرەکانیانن و ، ئێمە بەپێی سەربەستی بیروباوەڕ بڵاویان دەکەینەوە .

« نووسەری کورد »

# هەواڵدز

نووسینی : ڕەوف حەسەن

سەردەم (سەرەتای چەرخی بیستەمە ...١٩١٠ ـ ١٩٢١)

[بەر لەوەی چراکانی هۆڵ بکوژێتەوە بەچەند چرکـەیەك .. هیـوا لەناو هۆڵدایە]

هیوا : بیتاقە ..یانسیب ، دەرئەچێ .. بەختی خۆت تاقی بکەرەوە [بیتاقە دابەش ئەکات]

[شانۆ چۆڵە ... «یەکەم» بە تراکسووتەوەیە .. فتبۆڵێکی پێیەو یاری پێ ئەکات تا ناو هۆڵ بێ دەنگ ئەبێت ... ئەمجا دێتە پێشەوە .. فتبۆڵەکە بەدەستی ڕاستی بەرز ئەکاتەوەو .. ئەوەستێ .]

یەکەم :[بۆ بینەران] ببورن ... ئەم تۆپە ... ئـۆهــ .. جارێکی تـریش ببوورن .. ئەم گـۆی زەوی‌یەی هــەموومــان لەسەری ئـەژین‌و ئـەمرین پـڕە لە نهێنی ... زیاد لە چـوار هەزار ملیـۆن مرۆڤی لەسەرە .. لە هەناویشیدا ملیۆنەها ملیۆن تەرمی مرۆڤی هــەڵ لووشیوە .. هەر بێکەیان نهێنی‌یەکی سەر بەخۆن‌و جیهـانێکی تایبەتی . بەئاوات‌و هەست‌و نەست‌و بیـرو باوەڕو تـاوانباری‌و بێ‌تـاوانی خۆیـانەوە .. بێگـومان هــەزارەها نهێنی تـریش لە ئاسمان‌و دەورو بەریدا خـۆیان مــەڵاس داوە [وەك پسپۆڕێکی وەرزشەوان یاری پێ ئەکات ] مەترسن .. هیچی لێ نـایەت .. هەمووی توندو تۆڵ ... تۆکمە .. شەتەك دراوە ..

[ئەوەستێ ..] ئەم گۆی زەمینەمان بەدەست چەند داموو دەرزگایەوە شەق شەقێنی پێ ئەکرێت ئەئاوا [تێی هەڵئەدات‌و بە سەرو بەدەست‌و بەهەمـوو لەشی یاری پێ ئـەکات] ئـەئاوا .. [ئەوەستێ] هی واش هەن بیرلە چوار هەزار ملێون مرۆڤ ئەکەنەوە کـە پاشــەڕۆژێکی پڕ لە ئـاسوودەگیـان بـۆ بخـولقێنن .. [بـە دڵسۆزی‌یەوە دەست بە فتبۆڵەکـەدا دێنی] تا ئـەم نیشتمانـە بچکۆلانەیەی مرۆڤ بکـەنە بـەهەشتێکی ئـاوەدان لە هەمـوو گەردووندا .. بەڵام .. [بەسەر یاری پێ ئەکات‌و ئەیگرێتەوە]

بڕوانن .. ئا لەم سـووچەدا .. ئـا لێرەشـدا . ئێرەیش ئیرەیش ... [بە پەنجە نیشانە بە هەنـدێ شوێنی نـاوەڕاست‌و خوارووی تۆپەکە ئەدات]
چەند کۆمەڵێ مرۆڤی سەرگەردان‌وماڵوێران ئەژین .. لە زەلکـاودا .. لە دۆزەخـدا .. لە بـرسێتیـدا .. لە زێـرابی دوا کەوتووییدا .. نازانم چۆن‌و بە چ ووشەیێك وەسفی ئەو ژیانەیان بکەم .
ئالێرەشدا ..[ پەنجە ئەخاتە سەر بەشی سەرووی تۆپەکە] خەریکی جەنگی ئەستێرەکانن .. ستارز ووڕ stars war

دووەم :[بە تراکسووتەوە ڕادیۆیەکی پێیەوە گەیشتۆتە بەردەمی شانۆ]
جەنگی ئەستێرەکان .. بە هۆی چەند ئاوێنەیەکی تایبەتی‌یەوە
تیشکێکی تایبەتی ئەگرنە مووشەکە ئەتۆمی‌و نیوترۆنی‌یەکان‌و لە چاو
تروکاندنێکدا پێیان ئەگات‌و ئەیان تەقێنێتەوە .
سێیەم :[بەتراکسووتەوە ڕۆژنامەیێکی پێیە لە پشتەوە هاوار ئەکات ]
هەواڵ .. هەواڵ .. دوا هەواڵ .. جەنگی ئەستێرەکان .
دووەم :هەواڵ .. هەواڵ .. خۆ پیشاندان‌و مانگرتنی گەلان دژی بۆڕ بۆڕێنی
چەك کەڵەکە کردن .
یەکەم :هەواڵ .. هەواڵ ..
**دیموکراتێتی پیرەژنە دەمو لێوجوانەکەی ئنگلتەرا لە**
**ئایرلەندە ..**
**دادپەروەرێتی زایۆنیزم لە سەبراو شاتێللای لوبنان**
**پەیکەری سەربەستی ئەمەریکایی لە گرینادا‌و سلڤادۆرو**
**نیکاراگوا ..**
**بەزەیی‌و سۆزی چەتەکانی مافیا لە دادگاو زیندانەکانی .. ..**
دووەم :[پێی ئەبڕێ] بەسە .. بەسە .
[بۆ بینەران]
هەواڵ .. هەواڵبردن‌و هەواڵهێنان .. بەهۆی گوێ‌و چاوو
هەزارەها ئامێری جیا جیا .. ئامێری گەورە بەقەدەر کەشتی
ئاسمانی . بگرە بەقەدەر هەموو کۆشکی بنتاگۆن‌و هەموو ئۆرگان‌و
کەرەسەیی **CIA** سی ئای . ئەی **Sentral Intelligence Agency** .. تا
ئەگاتە بچووکترین ڕیکۆرد یان قوپچەیەکی بچکۆلانەی چاکەتێکی
برادەرێکت .
یەکەم :هەواڵ بە سەرتاپای ئەم جیهانەدا [نیشانە بە تۆپەکە ئەدات] وەکو
داوی جاڵجاڵۆکە دەوری داوە .. شەپۆلی دەنگ‌و وێنە .. لە لایەن
پەیامنێرو هەواڵدزانەوە بلاو ئەبنەوە .. بەڕاست‌و چەپدا .. بەڕاست‌و
بەدرۆو بە چەواشەکراوی‌و بە پرۆپاگاندە .
دووەم :خۆشەویستان .. بێگومانم بیستووتانە .. کە ژیژك نەرم‌و نیانترین
ئاژەڵە .. توخوا وانی‌یە ؟

**سێیەم** : حەز ئەکەیت هەر بۆ تاقیکردنەوە .. تەنیا جارێك پێستەکـەی بکەرە ملپێچ .. یا سەرین .. یا دۆشەك ..

**یەکەم** :وریا بە .. نەکەی توخنی کۆتر بکەویت .

**سێیەم** : **بێگومان** دڕندەترین ئاژەڵو باڵندەی جیهانە .

**دووەم** :ئاژانسی یونایتد پریس ئەڵێ .. واشەیەکی بە سەزمان بە دەنووکی تیژو دڕندانەی کۆترێکی سپی هەپروون بە هەپروون بوو .

**یەکەم** :پەیامنێری ئاژانسی ئاسۆشیتدپریس لە سەرچاوەییکی باوەڕ پێکراوەوە ڕایگەیاند .. هەمان کۆتر هەردوو چاوی ڕاوچی‌یەکی تا پڕ بەدەستی هەڵکۆڵی‌و وێنەی کابـراش بە گـوجانێکـەوە لە ڕۆژنامـەکانی سـەر لە ئێوارەی ئەمڕۆدا بڵاو ئەکرێتەوە .

دووەم :ئاژانسی ڕۆیتەر ئەوەی سەلماند کە کۆتر زیانێکی زۆر گەورە بەزانستو تەکنۆلۆژیاو سەربەستی‌و ئاشتی‌و دیموکراتی دەگەیەنێت .

**یەکەم** : سەرچاوەییکی باوەڕ پێکراو لە کێپ کەنەدی‌یەوە ئەمەی سەلماند کە تاقە کۆترێکی سپی .. بەڵێ .. تاقە کۆترێك بووە مایەی تەگەرە لە بەردەم کەشتی‌یەکی ئاسمانیـدا کە بـۆ مەبـەستی ئاشتی‌و هـەواڵقۆزتنـەوە هەڵئەدرا .

**دووەم** :ڕۆژ ڕۆژی هەواڵدزانە .

**یەکەم** : [بە تۆپەکەی یاری دەکاو ئەوەستێ] هەواڵدز [بەرەو دوا ئەکشێتەوە]

**سێیەم** : [سەیری ڕۆژنامەکە ئەکات] هەواڵدز [ئەکشێتەوە] .

**دووەم** :[گوێ بەڕادیۆکەوە ئەنێ] هەواڵدز [ئەکشێتەوە] .

**ئافرەت** : [لەم کاتەدا گەیشتۆتە بەردەمی شانۆ .. سەدری‌یەیەکی پزیشکی لە بەردایە .. ئەڵقەی دەزگیرانی لە دەستی ڕاستدایە] [بۆ بینەران] .
خۆشەویستان .. شانۆگەری‌یەکەمان ناوی « **هەواڵدز** »ە .

**هیوا** : [بەناو بینەراندا ئەگـەڕێ‌و سەفتـەیەك بیتـاقەی پێـیە .. هەنـدێکی بەناویاندا بڵاو ئەکاتەوە] .. بیتاقە .. یانسیب..دەرئەچێ .. بەختی خۆت تاقی بکەرەوە ..

**ئافرەت** :[سەیر ئەکاتو سەرسامە .. هۆڵ تـاریکە .. هیـچ نابینی] تکـایە .. شانۆگەریەکەمان لێ تێك مەدەن .. تکایە بێ دەنگی با پێکەوە سوودی لێ وەرگرین ..

هاوڕێکانم ! بە سیفەتێ کە من پزیشکێکی دەروونیم لە گەڵ ئەم هونەرمەندانەدا [دەست بۆ هەرسێکیان ڕائەکێشێ] هەندێ ڕاستیان دەربارەی هەواڵدزان بۆ ڕوون ئەکەینەوە . ڕەنگە هەندێکتان بڵێن .. ئێ دادە گیـان .. بۆ ئێجگـاری لە بنی کوولەکـەکـە نـادەن‌و چی لە کاسەدایە بۆمان ناکەنە ئەسکوێوە ؟! بەلاّم .. بەداخەوە .

**دووەم** : بە داخەوە ... هیچی ئەو تۆ لەو نهێنی‌و هەقیقەتانە نازانین .. هێندە هەیە ئەتوانن لە مشتێکی بچکۆلانە ، نموونەی خـەروارێك بـەچاوی خۆتان ببینن .

**ئافرەت** : زانایانی دەروونی‌و کۆمەلاّیەتی .. هەواڵدزانیان لە جیهاندا کردووە بە سێ بەشەوە .. ئەمەیان [دەست بۆ یەکەم ڕائـەکێشێ] نموونـەیەکی گرینگە .

**یەکەم** : بەڵێ :

ئاژانسەکان لە کۆتاییی ساڵی ١٩٨٤دا ڕایـان گەیـاند کـەوا لە شاری بۆپاڵی هیندستان‌دا کۆمپانیایەکی تێدایە بۆدروست کردنی گازی ژەهراوی ..

**دووەم** :کۆمپانیای یۆنێون کارباید ... بەناو کۆمپانیایەکی هـەمە ڕەگـەزەو لە ڕاستیدا ئەمەریکاییی ڕووتە .. لە بیرتان نەچێ .. زوربەی خەڵکی ئەو شارەی ئەم کۆمپانیایەی تێدایە نازانن ئێمزای خۆیان بکەن .

**سێیەم** : چل تەن لە گازی ژەهراوی کۆمپـانیاکـە سەرەتـاتکێ‌ی لەگەڵ ئـەو خەڵکەدا کرد .. هێندەی خۆش ئەویستن لە ماڵ‌و کێڵگەکانیاندا بووە میوانیان‌و لە هەناویاندا جێگیر بوو .

**دووەم** : لە ئەنجامدا دوو هەزارو پێنجسەد مرۆڤی ئەو شارە سـەرگەردانـە مردن‌و نزیکەی دوو سەد هەزاریشیان گاز لێی‌داون کە زیاد لەپەنجا هەزاریان خەتەرن‌و ژیانیان لە مەترسیدایە .

**سێیەم** : کۆمپانیا هەمە ڕەگەزەکە . ناوی هەموویانی نووسیوەو بڕیاری داوە زیانەکانیان بۆ ببژێرێت بە دۆلار .. **Dolars** .

**ئـافرەت** : ئـەمە پـوختەی هـەواڵەکە بـوو .. خەڵکی ئـاسایی وەك من‌و تـۆ ئەمەندەمان بیست .. واشمان زانی مەسـەلەکە هـەر ئەوەنـدەیەو هەڵەییکی ئاساییە .. بەلاّم لە ژێر ئەم هەواڵەدا ... هەواڵێکی هەقیقی

سامناك هەیە .. ئەم هەواڵدزە [نیشانە بە یەکەم ئەدا] چۆتە بنـج و بناوانی هەواڵەکەوە .. بازرگانی و قاچاخچێتی پێوە ئـەکات ... بـە هـەموو جیهـاندا ئـەیگێڕێت .. کێ پـارەی زیاتـری بـداتێ بـەوی ئەفرۆشێت .. بێگومان کۆمپانیاکەو دۆستەکانی تـەنانـەت بێدەنـگ بوونەکـەیشی لێ ئەکـڕن .. تا نهێنیـیـەکە . سـەرەونگون کـەن .. فـەرموون ئـەمەش هـەقیقـەتی هـەواڵەکـەیـە تـا بـزانن لەگـەڵ ڕووکەشەکەیدا چەند جیاوازە .

**یەکەم** : کۆمۆمپانیای یۆنیۆن کارپایدی سەر بە ئەمەریکا .. بەدەستی ئەنقەست شاری بۆپاڵی کردە ئـەزموونگـە (موختـەبەر) ێـك بۆ تـاقیکردنـەوەی مەفعوولی گازە ژەهراوییەکەی .. بۆ دیاریکردنی پلەی کوشندەیی بە نیسبەت کەم و زۆری خەڵکەکەو دوورو نزیکیان لە شوێنی تەقینەکەوە .. تا لە جەنگێکدا لە جەنگەکانی ئەم سەر زەمینەدا بەکاری بێنێ .. چ خۆی یان دۆستانی .. بۆ لە ناوبردنی مرۆڤ .. نەك مێش و مەگەز .

**ئافرەت** : [بەسەرسامییەوە لە یەکەم ئەڕوانێ] ڕەنگە بپرسن و بڵێن .. خۆ ئەم کابرایـە بەخت و خـۆرایی نهێنی هەواڵەکـەی درکانـد .. دیارە زۆر دەبەنگە .. یان ئەوەتـا مشتەری بـاشی لێ هەڵنـەکەوتـووە .. بەڵام هاوڕێکانم .. وانییە .. ئەم جۆرە هەواڵدزانە زۆر زیرەك و چاپووکن .. ئەوی ڕاستی بێت منیش سەرسام ماوم .. دیارە لەبەر خاتری ئێمـە ئەمەی درکاند .. [بۆ یەکەم] وانییە ؟ .

**یەکەم** : ببورە خانم .. نەخێر وانییە .. من خاترو ناتر نازانم ... بـۆچی من هیچم درکاندووە ؟! [بۆ بینەران] بەڕێزان .. کاری من ... یان بازاڕی گەرمی من لەو کاتەوە دەست پێئەکات کە ئەو بۆمبا کیمارییانە ئـەکاتـە دەست لایەنێکی جەنگ .. بەژمارەو پلەی کوشندەییانەوە . ئەو کـاتە هەواڵەکەم دەگاتە بازاڕی ڕەش و قسە لە گەڵ سەفتە دۆلاردا ئەکەم .. جا یا ئەوەتا هەواڵەکە بە ژمارەیەك دۆلار ئەکەم بەژێـر گڵەوە .. یان ئەوەتا بە ژمارەییێکی زیاتر دۆلار ئەیگەیەنمە لایەنی دووەمی جەنگ .

[کەمێ بە تۆپەکەی یاری دەکات] .. ببوورن .. هەرکەسێك ئەو چەکە نەفرەتییەی گەرەکە .. هەر ئێستاکە ئەتوانم بۆی پەیدا بکەم

پێویست ناکات چاوەڕوانی بەرهەمەکانی کۆمپانیای یونیۆن کاربایید بکەین .. ئەوەتا سەدو پەنجا هەزار تاوانبارانی دووەمین جەنگی جیهانی .. سەدو پەنجا هەزار تاوانباری نازی‌یەکان تا ئێستاش بەنهێنی‌و بە ئاشکرا قاچاخچێتی بەو بۆمباکیمیاویانەوە ئەکەن کە لەوساوە لایان ماوە ..

**ئافرەت** : [بۆ بینەران] کەسەکانم . جۆری دووەمی هەواڵدزان ..

**دووەم** : [دێتە پێشەوە] بەڵێ .. منم .. من لەبەرەی تێکۆشەرانەوە ئەچمە نێو ڕیزەکانی دوژمنی داگیرکەر .. دژی تێکۆشەران زماندرێژی‌یەکی زۆر ئەکەم .. تەنانەت بە کردەوەو رەفتاریش دژیان ئەوەستم ئەگەر زانیم پێویست‌و بێ زیانە .. هەموو میللەت نەفرەتم لێ ئەکەن .. هەردەم پرۆژەیەکیشم بۆ مەرگ کوشتن .. چ لەلایەن تێکۆشەران‌و میللەتەوە بەهەڵە .. یان ڕێکەوت . چ لەلایەن داگیرکەرەوە کاتێ کە ئاشکرا ئەبم لایان ... کاری من ئەوەیە .. نەخشەو پیلان‌و ژمارەی چەك‌و زەخیرەو هێزی دوژمن‌و ئەڵقەی لاوازی‌یان بگەیەنمە هاوڕێ تێکۆشەرەکانم .

**ئافرەت** : ئەم جۆرەیان نەك هەر زیرەك‌و بەتوانان بەڵکو بە تێکۆشەرێکی شەرەفمەندو مەزنیش دائەنرێن .

**دووەم** : بەمەرجێك بەپوختی‌و خاوەن بڕوایی‌یەوە مابنەوە .. بەلام سەواو مامەڵە بە ئێمە شەوە ئەکرێت‌و .. جاری واهەیە وەك بێبارێك .. ئەبینە کەری نێو جۆگە .. لە هەردوولا ئەخوێن .. یان هەر بەتەواوی ئەکەوینە نێو زەلکاوی خیانەتکاری‌و خۆ دۆڕاندنەوە وەك [دەست بۆ سێیەم ڕائەکێشێ] .. جۆری سێیەمی هەواڵدزانمان لێ دێت .

**ئافرەت** : ئەم بابەتەیان .. [ئیشارەتی سێیەم ئەکات] لە نێو ئێمەدا لە هەموویان زیاتر باوە .

**سێیەم** : [بۆ بینەران] .. برایان .. خوشکان .. بڕوا نەکەن .. ئەم ئافرەتە ئەیەوێ لە خشتەتان بەرێ . هەموو خەڵکی من ئەناسن‌و ئەزانن من نیشتمانپەروەرێکی بێ گەردم .. پێشکەوتنخوازێکی نەبەردم .. دڵسۆزی شاخ‌و هەردم .. بپرسن چەند ئازاو مەردم .. لە بنەماڵەیێکی خانەدانی کوردم .. ئا ئەمە [دەست بۆ ئافرەت ڕائەکێشێ] .. ئا ئەمە

من ئەیناسم .. دووزمانە .. بوختانم بۆ ئەکات .. هەوێنی نـۆ قازان شیرە .

**ئافرەت** : [بۆ سێیەم]

تەنانەت بە تەمسیلیش پێت شەرمــە ئەو دەورە بینی .. وەرە پێشەوە ..

[بۆ بینەران] .. ئەم کابرا هەواڵدزە .. جیـاوازی‌یەکی زۆری لەگەڵ ئەو دووانــەی تردا هــەیە . حــەز ئەکــەم خۆی بـۆتان ڕوون بکاتەوە .

**سێیەم** : [بە شەرمەوە دێتــە پێشێ .. ڕۆژنامــەکەی ئـەکاتــەوەو دای ئەخـا] بــرایان .. ئــەم کارەی من .. یــەعنی ئــەوەی من دەستم داوەتێ .. مەبەستم ئەوەیە .. من خەریکی کارێکم .. لە ڕاستیدا .. من ..

**ئافرەت** : تکایە بێ پێچو پەنا .. هەلێکەو دەستمان کەوتووە .. باکاتی خۆمان‌و ئەو میوانە ئازیزانە بەفیرۆ نەدەین .

**سێیەم** : ئێ .. تۆ لای خۆت پزشکیت‌و شارەزای دەروونیت .. قابیلە خۆم جارلە خۆم بدەم !!؟

**ئافرەت** : باشە .. ئێمە دەستەکەت ئەخەینەڕوو

[بۆ بینەران] ئـازیزانم .. خــەڵکی زۆر خراپ لەم بـابەتــەیان گەیشتوون .. وا ئەزانن زۆر زیرەك‌و کارامەن . چـالاکن . وائەزانن ئەرکێکی زۆر گرانیان بەسەرەوەیەو بەهەموو کەس ناکرێت .. بەلام کارو ڕەفتاری ئەم جۆرە هەواڵدزانە نەك هەر زۆر ئـاسانــە ، بەڵکـو بەهەموو دەبەنگ‌و گەلحۆو هیچ لەبارا نەبوویەکیش مەیسەر ئەبێ .. بگرە بەزۆری ئەوانەی ناتوانن بەڕیگەییێکی شەرەفمەندانەو ڕەنجدانی خۆیان بژین‌و پێ‌بگەن .. ئاسانترین‌و کورترین ڕێگە ئەگرنــە بەر بـۆ دەستکەوت‌و دەسەلات .

**سێیەم** : [لەم کاتەدا خۆی دزیوەتەوە بۆ ئەو دیو شانۆ] .

**ئافرەت** : [سەیر ئەکات] ئەوە کوا؟! .. بە هەر حاڵ .. ئەچێ دەست لەگـەڵ دوژمندا تێکەڵ ئەکات‌و ئەمجا ..

**سێیەم** : [بەدزی‌یەوە لە پەنایەکەوە گوێ هەڵئەخات] .

**ئافرەت** : ئەمجا بەدزی‌یەوەو بەئاشکرا گوێ ئەگرێ .. خەڵکی دێنێتە قسە .. سەر بەهەموو کونێکدا ئەکات .. بەزمانی لووس خۆی لەگەڵ ئەوانەدا ڕێك ئەخات کە بـۆی دەستنیشان کـراون . هەواڵی تێکـۆشەران‌و ئەندامانیان‌و نەخشەیان ئەکاتە دیاری دەستی بۆ دوژمن .. ئەنجام .. ماڵ ویران ئەبێ .. سەر بەفەتارەت ئەچێ .. بەرگی ئاودامانی ڕەش ئەپۆشرێ .. بەرەی میللەت نوشوستی دێنێ ..

**دووەم** : بـەڵام ئەوەی جێی داخـە .. خەڵکێکی زۆر پێیـان هەڵئـەخەڵەتـێن چەپڵەیان بۆ ئەکوتن .. داکۆکی نەفامانەیان لێ ئەکەن .. چونکە وەك ووتمان خۆیان بە نیشتمانپەروەرو پێشکەوتنخواز پیشان ئەدەن .

**سێیەم** : [لە پەناوە] ئێوە خۆتان خۆتان بەدرۆ ئەخەنەوە ... چونکە ئەگەر من گێل‌وگەمژەوگەندەڵ بم .. چۆن ئەتوانم بەوجۆرە خۆم نیشان بدەم ؟!

**دووەم** : نەخێر ... ئەمە نیشـانەی زیـرەکی‌و چالاکی خـۆت نی‌یە .. بـەڵکو ئەوانەی لغاویان کردوویت ئەمەت بۆ ئەڕەخسێنن .

**یەکەم** : بەڵێ .. ڕەنگە بتگرن‌و ماوەییك لە بەندیخانەدا هەوڵدزێتیت پێ‌بکەن .. لەم لاشەوە بەناو خەڵکیدا بڵاوی بکەنەوە کە لەسەر میلاکی تێکۆشەران گیراویت ..

ڕەنگە گرووپ‌و کۆمەڵێکی بەر هەڵستکارانەت بـۆ دابمەزرێنن‌و پەیڕەوو پروگرامیشت بۆ بنووسنەوە کە هەمووی دژی داگیرکەر بێ .. ڕەنگە لە کۆبوونەوەییکی فراواندا بتکـەنە ووتـار بێژو شتی وات بـۆ بنووسن .. هەر کە خوێندتەوە خەڵکی سەبووری پیا بێت‌و ئیسپـاتی دیموکراتیچێتی داگیرکەرو نشتمانپەروەرێتی خۆتی پێ‌بکەیت .

ڕەنگە .. ڕەنگە .. هەزاران داوو فاقەو تەڵەی وات پێ‌بنێنەوە کە خۆیشت سەرت لێـیان دەر نەچێ ..

**سێیەم** : ئێ باشە .. بڕایەوە .. شانۆ گەری‌یەکەمان هەمووی لەسەر منە .. دەبا دەست پێ بکەین .. [ئەڕوات] .

**ئافرەت** : [بۆسێیەم] مەڕۆ .. جاری ماوتە .. هەروا نایخوێیت‌و ئەنجام .. کات‌و ڕۆژی خۆت دێت‌و بەر نەفرەتی میللەت‌و گەورپی مێژوو ئەکەویت .

**سێیەم** : [دەنگی دێت] ئێوە کەرن .. نەفامن .. نازانن بیخۆن .. ئەنجـام ..

ئەنجام !! ئەنجام چی ئەبێ قیروسیا .. سەگ لە قەسابخانە نەمرێ عەمری بەزایە ئەچێ .. هەر منم لە هەموو سەردەمێكدا دەستم ئەڕوات .

[لەم كاتەدا دەنگی سەگوەڕ ئەبیسترێ .. دووەم ویەكەم ئەچنە ئەو دیو شانۆو .. ئافرەت دێتە خوارەوەو لە پەنایەكدا ئەوەستێ]

## « دیمەنی دووەم »

**سەگەكان** : [دەنگیان دێت] وەو .. وەو .. وەو .. [تووتەڵە سەگێكو بەدوایدا گەماڵێك « پیرەمێردو لاوێك » لای چەپی شانۆوە دێنو پەتێكی درێژیان پێوەیە . سەرو كارت لە ملیاندایە] وەو .. وەو .. وەو .

**سەگەوان** : [دەنگی دێت] .. وەرنەوە ... وەرنەوە .. ئەوە جووتی سەگ نایابلر .. ئەوەڵبابلر .. تەنزیلات .. [سەگەوان دەر ئەكەوێ سەری پەتەكەی كردۆتە ملی خۆی .. نانێكو ئێسقانێك بە هەردوو دەستییەوەیە .. بەرگی سەردەمی عوسمانلی لە بەردایە] وەرنەوە .. جوتێ سەگ .. ئیكی كیوپەك .

**سەگەكان** : وەو ... وەو ... وەو ..

**ئافرەت** : [بۆبینەران] هاوڕێكانم .. زۆر جار چاوو گوێو مێشكی مێشكی مرۆڤ دەرك بە هەقیقەتی شتەكان ناكەن .. جا بۆئەوەی كەسمان سەرمان لێ تێك نەچێت .. برای دەرهێنەر وای بەباشی زانی بۆ یێكەمین جار ئەمانە [دەست بۆ سەگەكان ڕائەكێشێ] تان بەم شێوەیە پێشان بدات .. چونكە لەو بڕوایە دایە ..

**دەرهێنەر** : [لەو لای شانۆوە .. بۆ ئافرەت] سوپاس .. سوپاس .. [بۆ بینەران] .. ببورن .. ئەمە بۆ چوونی نووسەری شانۆییە كەیە .. منیش وای بەڕاست ئەزانم كە هەقیقەتی ڕووتتان پیشان بدەین .. ئەوەش دەزانین كە تا نهێنییەك ئاشكرا ئەبێ سەدانو هەزاران قوربانی ئەدرێت .

بەو ئاوەختە
سەری کۆچێکی شێتانەی هەڵگرتووە
دەڕوە    دەڕوە بێ پشوودان
تا ئاوێنەی شاری تیشک
ڕاناوەستە
لە باوەشی دەریای مەنگ
لە خەوەدا بووە پەلیان بەستە

* ● *

چەپکێ گزنگ
دڕ بە تاریکیەوە دەدات
ڕەگی قووڵ بیری پەسیاو
لەناو نیشتمانی مێشکی پاکی مندا
زیاد ڕۆ چووە
پەرژینی چڕی تووترکی
باخچەی دڵ دەپچڕێنێ
بەمیوانی ڕۆشنایی ڕۆژ
لەو مەڵبەندە ئەو کۆچ دەکات
لا دێییەکان
باسک لە یەکتر وەردێنن
پەساپۆرتی پەڵە هەورێکی زامداریان
هەڵگرتووە
شۆڕەبییەکان
موتوربەی ئەزەلی دەبن
کوێکەی تازەی داری حەزەخور ماچ دەکات
تیر بەسییە تینووەکانی
شنەی بەیان هەڵدەمژێ و
کوترەشینکەی هەموو دونیا
ـە تاکوڵ نوقرە دەکرێ
جوانترین پەلکە زێرینەی دوایی باران
بۆ جیهانی نوێی مرۆڤ
گۆرانی ئاسایش دەچڕێ

# لەیلان

صدیق خالد هروری

لەیلا نا من
چەند هێژایێد هێژا مرن
ئەز نەگریم
چەند عەزیزێد دلا مرن
ئەز نەگریم
وەلێ بوٚتە..
لەیلانا من
بشەڤ و روٚژا
بدل و چاڤا
ئەزێ دگریم

* * *

لەیلانا من
تو یا ساخی و
تویا مری ؟!
لەیلانا من
ئەڤە تویا دچاڤێد منداو
ئەزێ دنیڤا چاڤێد تەدا
تو ئەڤەیی و
تویا بری ؟!
لەیلانا من
ڕابە لهنداڤا سەرێ من
سێ جار جارا وەرەو هەڕە
بوٚ دەردێ خوٚ
بوٚ دەردێ من
سترانا مانێ بستره
مەلوو رینەو
مەکە گری ؟!

* * *

لەیلانا من
تو یا دبینی
تو دزانی
بیهنا دهێتن
بێهن کو ژیرا پرچا تەیە
ئێدی تبلێد من چ شەکەن ؟!
لەیلانا من
ڕەنگێ چاڤێد تە کهوٚری
ڕەش و سپیکا تێکەل کری
ئێدی چاڤێد م لێ سەیرکەن ؟!
لەیلانا من
خەما نەخوٚ
من ناڤ و دەنگێ تە هەیە
من تو هەیی
لەیلانا من
لەو هەر تویی و
مانا منی
شیرێ مە بهێڤینی مە یی
هەلزا بەر لاتێد چیا
هێنگێ ملشین
دەمێ بەیی

# پێـــــــنج دەنگ

خالد حسین

(١)

گەر ئەڤروکە
ئەڤ پەیڤاهە
خوە لەرزاندو وێ خوە کر [illegible]
روژا بێتن
یان ئەڤروکە
ڤێت ئەڤ پەیڤە
بکە کەنی
ما نە وەیە
پەیڤا شیرین ؟
دێ ڤی گریو ، کولو خەما
ژ ڤا ژارا
هەر هەر رەنی .

(٢)

شیرین
دل دەرتینە
د گڤێشە
ڤینا ئەڤێ ژینێ ژێ تێ
کولێن ژینێ
پێ دکەوینە .

(٣)

[illegible] خوە
[illegible]
دو [illegible] ئەوێ دشیڤت
داکو [illegible] ژینەك مەزن
مو ڤی [illegible] ڤرێکەتن
ژکویراتییا ئەو بستینت .

(٤)

گول جوانییێ
بشکوژێن رەنگ
ب ژینا خوە
خوەیی دکە
داکو کەو و پەلیتانکێن

(٥)

لرەخێ خوە ... بجەمینت
روژ .. هناڤێت خوە
دکەلینت
دسوژینت
دا رون کەتن
ریکا هەژارو کەتییا
و ... تارییێ ڤەمرینت .

# شاعیرێکی رەنگ بۆرێژراو

حەسیب قەرەداخی

لە ناو لەپی جەپلەیەکدا خۆی با ئەدا
شەنی لێ گرت بەدەستەوە
کاودانی خۆی بە باکردو
زێرابی ماڵە گەورانە
دەمو کەپووی خۆی رائەدا
ـ ئای کە حەیفە نیوە شیعرێك
دنیا نەکات بە ئاگرو
رووی دوو رووان نەسووتێنێ
نیوەکەی دی رەهێڵەیەك
بۆ سەر پەلەی شارانی خەم
نەبارێنێ ـ
بۆیە وتم..
کوڕە کابرا ئەتۆ ئاگات لە خۆ نی یە،
لە دەرباری زۆر داراندا
لە بازاڕی بێ باراندا
وشەکانت وا خەریکن دەرپێکانیان دائەکەنن
ئەی دەن بەسەر شانی تۆدا !
هەروا زۆڵەو فرتەیان دێ
لەناو نوێنی ژانی تۆدا.

# شانۆی رۆژگار

حەسیب قەرەداخی

سۆزانی یەك لەسەر لەپی شانۆی رۆژگار
وەكوو دۆلفین لەناو گۆمی رووناكیدا خۆی پائەدا.
بە لایەكی سەرزەلی خانەی حەورەمەكی دائەدا
بۆ ماقوولانی ناو هۆلیش..
تاوێ پێش و تاوی پاشی بۆ هەلّ ئەدان،
بەدا هێشتنی مەمكان و هەلّلینی بوورەو رانی قورس و سووكی لە كەلّ
ئەدان.
زریكانی..
قووی كرد بەناو هۆلّ خەستا. شلەژانی
دەستی داهێشت بۆ ناو كەلی
ـ ئێرە جێگە سوجدەقانە،
لەناو پێكی بەردەمتانا هەرچی هەیە
لێرەوە بۆم تێ كربوون، ئاوە، مەیە ـ
لەبەرپێیدا بوو بە هەلاّ..
ـ ئێمە چاكین.
ئێمە پاكین
تۆ وەك بووكە مندالاّنەی
بە تەوژمی پارەی ئێمە هەلّ ئەقونیت
لقكە شلمیت
ئارەزوومان هەلّ ئەچنیت
جارێك بانت ئەكەین بەژێر
جارێك ژێرت ئەكەین بەبان
جارێك بەبان تۆ ئەسێنین
جارێكی تر ئەتدەمین بەبان
تۆ هەرپێشی، تۆ هەر پاشی
تۆ ئاو دەستی تۆ كلاشی ـ
كلرامە بوو
پاشی خۆی بۆ دەریەڕانن
هەرچی پاقی هاشەو هووشەی
هۆلی هۆلّ بوو
بە بایەكی بۆی دڕانن !

# «ماڵ ئاوایی»

□ شیعری: سیامەند محمد □

لە دەفتەری بیرەوەری ژیانما
ئاواتی دوور، خەوی وەنەوشەیی بلوور
خراونە چاڵ.
تەنها چارێ هەڵنەکراوە، مۆمی ئاهەنگی سەری ساڵ.
وا سەعاتی ماڵ ئاوایی ژیانی من لێ ئەدا
گەردەلوولی ڕۆژگاری سەخت وونم ئەکا

● ● ●

هەر باڵدارەو، بە ئاسمانی شینی جوانی بێ سنورا مەلە ئەکات.
هەر دڵدارەو، دەسگیرانی بۆ جێ ژوانی
تازەی ئەبات.
وا سەعاتی ماڵ ئاوایی ژیانی من لێ ئەدا.
گەردەلوولی ڕۆژگاری سەخت وونم ئەکا.
بەڵام کاتێ، کە ئاگری بەرزی ئەوین
شاڵاو دێنێ
گڕ لە هێلانەی خەم بەردەداو ئەیسوتێنێ.

١٩٨٤ سلێمانی

پارچە شیعرێکی بڵاونەکراوەی لوتفی[1]

# نەورۆز

ئەم شیعرە لە بەڕێز کاك عوبێد کوڕی شاعیر شێخ لەتیف بەرزەنجی دەستم کەوتووە کە ساڵی (١٩٥٩) وتوویەتی:

ئامادەکردنی
محمد زەهاوی

نەورۆز ئەوا هات دونیا ڕازاوە
بەفرو زقووم و شەختە تواوە
ڕوبارو کانی گشتە کەوتە خرۆش
بولبول ئەخوێنێ دڵی پڕ لەجۆش
دارو درەختی گۆی چەم ژیاوە
چیاو دەشت ودەر بەگوڵ رازاوە
نرگس و بوبیوون کەنیرەو نەسرین
یاسەمەن لەگەڵ وەنەوشەی ڕەنگین
دارو دەوەنی خاکی کوردستان
جوان و ڕازاوە وەك باغی ریزوان
لەم ڕۆژە خۆشە لەم فەصڵە جوانە
کە ڕۆژی جەژنی پیرو لاوانە

١

# شێعر بۆ هەموان

شیعری:
**روکیه دالتۆن- سلفادور**

**••**

**«شێرزاد عبد الرحمن»**
**کردویە بەکوردی**

منیش وەك تۆ،
ئاشقی خۆشەویستیو ژیانم..
ئاشقی ئەو شتانەی پیی٘ی مەستم..
ئاشق بە شینایی ئاسمان.
منیش وەك تۆ،
خوێن لە ناخم دەچۆریٚو،
زەردەخەنە لە چاوەکانم.. دەبریسکێتەوە.
ئەو چاوانەی، فێری تنۆکی فرمێسکن.

——— •••• ———

منیش دەزانم، دنیا، رەنگینە
دەزانم، شیعر، وەکو نان وایە
لە پێناوی هەمواندا، لە دایك دەبیٚ
خوێن بە تەنیا لە جەستەمدا ناسووریٚ
بەڵکو خوێنم، وەك رووبارە
دەچێتە ناخ دەماری جەنگاوەرانەوە..
لە پێناوی خۆشەویستی وژیان..
لە پێناوی شتە جوانەکان..
لە پێناوی ئاسمان..
لە پێناوی شیعریٚ- بۆ هەموان

# ئەی نـــــــــــازدار

شیعری فاضل قصاب

«پێشکەشە بە کەریم و ڤیان»

ئەی نازداری گڕ هەناسە!
ئەگەر سێوی دڵی ماندووم
بگریتە دەست،
گەر ئەستێرەی بەختی نوستووم
لێت دەرکەوێ،
ئەگەر کەشتیی پیرۆزەیی چاوەکانت
ڕووەو دەریای
خەمی غەریبیم سەرکەوێ،
گەر ئاسمانی ئەفسانەیی
هەواری تارم نەیبکەی،
لە دەرباری خانمێتیو
لە دوورەوە
شازادەیی پڕ نوورەوە
عەسای فرمانت هەڵئەدەی
فریشتەی سۆزت تاو ئەدەی:
- بڕۆ کێوەکان ببڕە.
- بڕۆ عەتری هەناسەم

لە دەریاکانا بڕژە.

- بڕۆ بە تاڵی پرچم، گەردی ئەستێرە بسڕە.

★ ★

ئەی شازادەی هەناسە گڕ!

ئەی سامالّی کانونی تۆف!

تۆ ڤینۆسیو

منیش شێت و بەندەیەکی دەرۆزەکەر

تۆ ئاسمانیو

منیش سەربازو قەلەندەر

من بەهیوام لە تەلارو لە دەرباری

نازو عیشوەت بێتە خوارێ

بەیانی‌یەك تا ئێوارێ

نووری چاوانتم تێ‌بگری

بارانی عەشقت دابکاو

تەنها جارێ

گڕی سینەت بە جەستەما

بێتە خوارێ.

فایدە

1985/5/21

ئەمجارەشیان
گوێچکەم بەر دەنگی فریشتەی خەمەکان کەوت
ئەو دەستە بووی
دەروازەی دڵی تەنگمت
واڵا کرد ... و
هەر هیچ نەبێ بە شیعرێکی ڕەنگ ئاسۆیی
چرایەکت لە تاریکستانی ناخی ئاخما هەڵکرد
تۆ خۆت خەمی
خۆت لەگەڵ ژانا هاودەمی
کەچی هەموو ئان و ساتێ
بەڵێنی هاو دەنگی خۆت نوێ دەکەیتەوە و
دەنگی ئەبەدی بیرەکەت
لە هەرکوێیەک بم ئەمگاتێ و ... هەر ئەمگاتێ

---

● دیرە شیعری ئەحمەدی هەردی شاعیرە

# شیعرێك و شاعیرێك

وەرگێران و ئامادەکردنی
حسین احمد جاف

توماس هود... شاعیریکی ئینگلیزی بەناوبانگە. سالّی ۱۷۹۹ زاینی لە شاری لەندەندا لەدایك بووەو سالّی ۱۸٤٥ زا کۆچی دوایی لــە هەمان شاردا کردووە. ئەم شاعیرە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرەکانی قوتابخانەی (ڕەمزی کۆمەلایەتی) کە هەمیشە دژ نەریتە بۆگەنەکانی کۆمەلی سەرمایەداری دەوەستاو بووچی دەکردەوە.. بەلام ئەم پارچە هۆنراوەیەی شاعیری ناوبراو.. کە لەم دێرانەی خوارەوە دەقی وەرگێرانی هاتووە، مۆرکی قوتابخانەی ڕۆمانسیزمی بەزەقی پێوە دیارە.

## ڕابوردوو ئیستا

هەر لەبیرمە... هەر لەبیرمە
ئەو خانووەی کە چاوەکانم تێیدا هەلهێناوە
ئەو دەلاقە بچکۆلەیەی کە تالّە خاوەکانی
برچی ڕۆژ بەناکاوی سەری پیا ئەکرد
لەگەل یەکەم گزنگی بەیاندا

هەر لەبیرمە هەر لەبیرمە
ئەو درەختە (تەنوبە)[2] بەرزانەی
کە لە سەوزیدا ڕەش دەنوێنن
هەمیشە خەونم بەو ترووپکە سەر کەشانەیەوە
دەبینی کە شەڕە قووچیان لەگەڵ
کەشکەڵانی فەلەکدا دەکرد
ئەو خەونانەم ئاوێنەی پاکی سەردەمی
منداڵی بوون...
منداڵی کەسێك کە ئێستا پاش دەزانێ
ئەوساکە لە ئاسمانەوە گەلێك نزیك تربوو
لە ئێستادا

---

١ ـ لەیلاك جۆرە گوڵێکی جوانە
٢ ـ تەننوب جۆرە درەختێکی بەرزە

# ژ ڤەریێژا جەنگا مەزن

پیرا بدلیسی ژ برایێ خوە شاهین ،
ئێ کو پشکداری دجەنگا یەکەما جیهانیدەکری ،
بهیستیە .. من ژی ل روژا ١٩٦٧/٨/١٤
ژ زاردەڤێ وێ نفیسیو کێمەك ژ ئاوایێ
خوە لێێ وێ گفراند ئەڤ شێوازێ
ون دبینن ژێ دەرکەت .

● سەبری بوتانی ●

ژ چار سەدان ئەم شێست و هەشت کەس ژ کوشتنێ ڤەرەستبوونوئەو سێ روژ بوون خوارن ژی بدەڤێ مە نەکەتی .. زك و پشتێن مە بهەڤە نووسابوون . زابتێ مە حکمەت ئەفەندی هاتوگوت :

- « دژمن مە بکوژن بلا .. مرن ژی بلا ... لێ پرفهێتە ونەدروستە ژی ئەم خوە بمرینن ... لاونو خوە مەسپێرن ڤێ مرنا کرێت .. ئەڤە ئەزیەك ، چەند نەفەرەك دن ژی ناڤێ خودێ بینن رابن ئەم خوە بەردن ڤێ دولا درێژ ئان خوە بگەهینن ناڤسەرا ڤی چیایێ مەزن . خودێیە بابێ رەحمێیە . بەلکی بەرازەکی ، پەزکوڤیەکی ، هوڤەکی ، هەما خودێ چکر قسمەت ئەم ژ خوەرە نێچیر بکن » .

حكمەت گەلە گۆتنێن وەك ڤێ ، دو جار و شەش جاركر ، لێ ژچار نەفەران پێڤە دەست بلند نەكر .. نێچیرڤانێن مە چوون ، لێ مە باوەر نەدكر كو ئەم و ئەو جارەك دە هەڤ بیبینن ... رەپرپا دلێ مەیە و دەستێ مە پێڤەیە .. و مە « ئایەتا كورسی » ژی دخووند و پف دكرە خوە و چیایێ بلند ، و ژخودێ دخوەست كو نێچیرڤانێن مە بساخی لە ڤەگەرێن و نێچیرەك بەركەتی ژی ئانیبن .. قەنج بوو هێژ رۆژێن مە و وان ژ دنیایێ هەو نەببوون . بەژنەك رۆژ مابوو هاتن و هرچەك مێ لپەی خوە رادكێشان وەك گاكی بوو ئەو نەفەرێن ژار و سار لتەرمێ هرچا خوە وەرهاتن وەك بچووكێن هوور خوە لدۆرێ هـلاڤێتن . هەزار یـاهێ یاهێ لنێچیرڤانێن خوە باراندن .. حكمەت دزانی كو نیڤەك ژ نەفەرێن مە گـوشتێ هرچێ ناخون ، لێ ئەگەر بخون ژی ، دێ پێ تادار ببن ـ نساخ بكەڤن ـ ژلەو گازی مەلایێ مە كر و گۆتێ :

- « خۆجە ... خۆجە ... ئەز خولامۆ خۆجە ، لەزكە وەرە گۆشتێ ڤێهرچـا خودێ لە حەلالكە » .

مەلایێ نیڤ مرۆڤ بكۆتەكی خوە كەناند و گۆت :« ئەزێ چـاوا حەلال كم ؟!! ما بەرخە ئەز حەلال كم ئەفەندم ؟! »

حكمەت ئەفەندی تیقەتیق ژخوە ئانی و گۆت : ما كو بەرخ بوویا « فەتوا » تە ژبو چ بووسەیدا !؟ .. پا تو چتۆڤ مەلایی ! مە هزر دكر تو سەیدایەكی ژیرو زانایی .. مەلا ئەو مەلایە ل تەنگاڤیەك وەك ڤێ رێیەكێ ببینێ و ناڤێ خودێ لێ بینێ . ما نەوەیە ئەسكەرنۆ ؟. ون ژی تشتەكی بێژن ، شەریعەتا من و مەلایێ خوە بكن »

هنا گۆتێ : تو خوەش دبێژی ، هنا ژی گۆتێ : بخودێ ئەم بمرن ژی ، هەتا خۆجە ئەفەندی « فەتوایێ » لسەرنەدت ، ئەم دەڤ لێ نادن . مرنا مە گەلە خوەشترە ژ خوارنا گۆشتێ ڤێ هرچا پیس .. خۆجە كو دیت دێ دل نەخوەشی ژێ چێبت و هەم ژی ئاگر بەردبوو هناڤێ وی كو ئەسكەرێ بێ خوارن ددیت ، دلێ وی رانەگرت ، رابوو سەرخوە و ناڤێ خودێ ئانی و گۆت :

- « لاونۆ های ژێ هەبن ، نەهێلن ، دلۆپەك تەنێ ژی ژ خوونا وێ برژێ ، بەری هەر تشتی پیانەكێ ژێ داگرن بینن دا ئەز سەر پشێ خوەدە كم . كەزەبا وێ ژی بینن ئەزێ بخاڤی و نەشۆشتی . بخوم ... پاشێ ژی لەزێ لبـراژتنا گۆشتێ وێ بكن و قاقبەكێ ژی ژێ بكەلینن بلا خوەشمێرێن مە هناڤێن خوە پێ

گەرم و نەرم بکن .. چ خوارنا هەبت بهزرا دورستی و حەلالیێ راهلنێ و بێگومان بخون ، دا لوە بگڤریێ . گوشتێ ڤێ هرچێ ژی وەك ییێ بەرخەکی لوە حەلالە ، وەك شیریێ دایکێن وە لوە دورستە ناڤێ خودێ لسەر بینن و ژدل بخون » .

ئەڤدوکێ جزیری ، کو « چەپوکێ سەرمەزن » ژی دگوتنێ ، ژکێفادە خوە هلاڤێت و گوت : ئهەی تو چاڤێ سەرێ منی مەلا ، سەر بەختێ من تو دوزدە « علمی » .

تو مفتی‌یێ زەمانی
بکەفیل و دەمانی
ئەڤە ژنوو من زانی
تشتەك نینە نەزانی
پر بدەڤ و ئەزمانی
مەلایێ ئالی ئوسمانی
تو کەوی هەم کەمانی
ماکا کێف و خەمانی
شارەزایێ قورئانی
« فەتوا » ژبوٚ مە ئانی
تو هەڤالێ ژارانی
لمە نەکر بار گرانی

چەند نەفەرەك زك ڤالا ببایێ بەزێ راهێلانێ ، هرچا خوە بخەنجەر و قامەیێن تیژ کەڤلاندن ، ئەو گوشتێ تەڕ و پڕ و قەلەو چاڤ ژێ تێر نەدبوو ، ژەڤ دەرانین و پەرچە پەرچە کرن .. حکمەت ئەفەندی بقورەتی هاتە پێش و گوت :

– « دەون بزانن کائەم ئیرو چ شێرن و چ نێچیرڤانن ژی ، ما نەوەیە ؟ تو چاوا دبینی مەلایێ من ؟ »

مەلایێ نیڤ مری و ژخوە هەو ، دیسا بکوتەکی خوە کەناند و گوت :

– « ون دبینن ڤێ هرچا ژمن بەخت رەشتر ، چاوا ئەڤ حکمەت ئەفەندی لسەر سەرێ مە کر ئەسکەندەر ؟! تو دبێژی قەی تەختێ قەیسەر ستاندی‌یە ! » .

حکمەتێ بەژن بلند و ئاز و چل سالی ، سەرێ خوە هەژاند و ژ هەمی دلێ خوە گۆت :

– « سەر بەختێ منێ بەری ڤێ جەنگێ ، ئەڤ نێچیرا مە ژبۆ حالێ مە یێ ئێرو گەلە ژ ستاندنا تەختێ قەیسر و یێ سولتان ژی چێترە »

چەپۆکێ سەرمەزن خوە نێزیك کر و گۆت :

– « خوەزی وە ئەڤ هرچ خانم نەکوشتا ، هەکە وە بساخی ئانیبا منێ لخوە مەهر بکرا ، ئەو دەست بشکێ یێ ئەڤ خانما چیایی کوشتی »

ئەو نەفەرێن مەلۆل و برچی هەروەکی قەت برچی نەبووبن ئان ژی برچی بوونا خوە ژبیر کرین . گازی هەڤ کرن : « بخون بخون هەر بخون ، گۆشتێ ژنا چەپۆ بخون »

پشتی هنگێ بسێ رۆژان ، بفەرمانەك ئەسکەری ، مە ئەو جهێ خوە بەردا و ئەم چوون جهەك دوورتر ، و خوە دکۆرتەك پان و درێژدە چەپراند ، ل هێڤیبا هاتنا « بێلۆکەك » ئەسکەر ، کو ئەم و ئەو هەڤرە بچن بگهن « فرقە »یا خوە ، یاکو خوە ژبۆ ئێریشەکێ بەرهەڤ دکر ... چەپۆکێ سەرمەزن کو ئەڤ زانی ، هەردو دەستێ خوە رابەری ئەسمانی کر و بدەنگەکی بلند گۆت :

– « خودێ یووو.... ئەز گۆری یوووو ... رەڤ ژمە نایێ ئەو بەرێ مە ددن ئێریشێ »

حکمەت ڤێ جارێ ژ دل خوە ئەنراند و گۆتێ :

– « کورۆ چەپۆکێ چەپەل ، بەس بڤان گۆتنێن خوە دلێ ئەسکەر ژ ئەسکەرییێ سارکە . من نەچار مەکە تە ژڤان گۆتنێن پۆچ و ڤالا پەشیمان کم »

چەپۆ رابوو وەکە شێر ، بوی دەنگێ خوەی بلند ، گۆتە زابتێ ئوسمانلی :

– « ئەفەندم ... مائەز نەهەقم ؟! دە هێشکۆ مە نیڤ تێر کن پاشێ داخوازا ئێریشێ ژمە بکن ... مە نان نینە ئەو فیشەك و بەرکێن تۆپان ژمەرە رێدکن ... شکر ژ خودێ رە تە بخوە ژی دیت پێر چار نەفەر دچەپەرێ هنداڤ دەڤێ گەلی دە ژ برچا مرن ، دەکا لهەوران بنێر ، ئەوژی ژبەر ڤی حالێ مە خەمگینن ، هاها دێ روندکان بیارینن »

حکمەت ژ چەپۆ حەز دکر ، چونکی ئەسکەر بتناز و یاری و ترانێن وی کێف خوەش دبوون ، هینی خوراگرتنێ دبوون ... لێ مخابن گەلەك دلۆڤانێ دەولەتا

ئالی ئوسمان بوو ، چەپەر چەپەر و چادر چادر دچوو ئەسکەرێ خەمکین شیرەت دکر ، کەسێ سل و برسی هاش دکر ... حکمەت ئەفەندی کو زانی ئێریش نێزیك بوویە ، ئەسکەر لخوە جڤاند و گۆت :

- « ئەم بێ نان و دەرمانن راستە .. ئەم دل شکەستینە راستە ... ڤێ جەنگا مرۆڤ هێر ترسا مرنێ ئانی‌یە بەر چاڤێن مە ، دیسا راستە ، لێ باوەر بکن کو دژمنێ مەژی مینا مەیە ، و پڕ ژمە ترسیایە ژی چکو مە چاڤ شکاندی کریە ... ڤێجا قەت خوە تەنگاڤ مەکن ، هاها خودێ لهەڤ ئانی ، سێ ـ چار ـ پێنج رۆژ دن ، نان و گرارێن گەرم و نەرم و خوەش لهێڤیيا مـەنە ، هنگێ ڤێجـا بخون ڤەخون و ژ خودێ بخوازن کو سەردەرا سولتانێ مە بلندتر بکت ... بزانن ژی کو دنێڤبەر وێرەك و نەوێرەك دە، تەنێ هەر مۆیەکەو بەس »

چەپۆ سەرێ خوە راکر و گۆت

- « ئەو بەحشتا کو حکمەت ئەفەندی ژێ دبێژت ، خێرا خودێ یە و ژ قیز و بووکێن ئوروسان داگرتی‌یە ، هەرنێ و خوە گیر مەکن . لێ ترسا من ئەوە کو هەر کەزی‌زەرکێ سمبێل سوورێ خوە هەبت .... خودایۆ تو هەقێ مە وندا نەکی ، ژ وی بستینی ، یێ ئەز دزانم » .. ئەڤ گۆتنا چەپۆ گەلە ل خۆجە خوەش هات و گۆت : ئامین یارەب » تو ڤێ داخوازا چەپوکێ نیڤ منافق بجی بکی » ... هەمی کەنین وگۆتن ئامین ئامین .. خۆجە ژ حەنەکا حەز دکر ـ هندەك ژ حەنەکێن چەپۆ نەتێ ـ حکمەت هەرچەند دهزرکرنا خوەدە ژ وان جودایە ، لێ دچاخێ ئوسا دە « وەریس ژ رەخێ خوەڤە سست دکر » وی ژی وەك وان دگۆت و دکر ژی دا خوە ژێ نەدن پاش و بگۆتنا وی بکن . لەوژی بەرسڤا چەپۆ نەدا . لێ وی بسەر گۆتنا خۆجەڤە زێدەکر ، گۆت « ئەز ل بەختێ تەمە سەیدا ، تو ژ بهایێ چـەپۆکێم نەکی ، چەپۆ ، یەك و نیڤە ، نە نیڤە ، مینا کو تە کەرەم کری »

چەند رۆژەك دن ژی سەرڤەچوون ، پەرگالا مە هێژی وەك خوەیە و دیارە کو دێ هەر وەلێ بمینت ژی ، ئەگەر خرابتر نەبت ، نیشانا ڤێ پەرگـالێ دوان گوندێن نیڤ وێران و نیڤ بەردایی‌رە دیاربوو ... چ گوندێ ئەم دچنێ ڤرت و ڤالایە ، هەکە تەك تەکێن مالان هن ژن و زارۆك و کەسێن ژکارکەتی تێدە هەبوونا ژی ، ئەوژی وەك مە شەپرزە بوون . ئوسا ژی ئەم نەچار دبوون تشتنە خوارنێ ژوان بستینن .. رۆژەکێ ژسێ گوند مەزن ، مە پازدە کلۆر ئانین ، هەر شەشا ژمە

نانەك و نيڤ بەركەت .. چەپۆ ژ كۆرفە لاقى هودهودەك ب رێڤە گرتبوو ، ژكێڤادە ستراند :

**تەيركۆ بالەفرۆ خودێ ئەز تە بەرنادم**
**كەس نەكريە و ئەژى ناكم**
**ڤى زكێ ڤالا برسى ناكم**
**هودهودۆ هێلين وێرانۆ**
**خەلك و شێنى دبێژن**
**تو قازدێ پەلقيس و سلێمانى**
**بەخت رەشۆ ئەز چ بكم كو ڤێ ئێڤارێ**
**تو ژ جانێ ئەڤدۆكێ جزيرێرە خوەش دەرمانى**
**ئەزێ بناڤێ سولتانێ خوە تەبخوم**
**دا شەرێ مسقوڤا بكم ب زكێ تێر و قەهرەمانى**

چاڤێ حكمەت ڤێكەت و گۆتى :

« كورۆ چەپۆ ئەو چيە زۆ بەردە ما تو ژخودێ ناترسى تە ئەو چۆچكێ دلۆڤان گرتىيە ؟ . ما تە نەزانىيە پۆستەچىيێ سلێمان پێغەمبەر و پەلقيسێيە ؟ »

بەرسڤێن چەپۆ هەردەم حازر و ئەنتيكەنە ،

گوتێ : پاب خودێ ئەو كورێ سلێمان پێغەمبەر بت ئەزێ وى ل بنێ زكێ خوەدم ... چبكم « ئەفەندم » دەرمانێ زكێ ژارە ، جايى نان و گرارە »

سێ رۆژ دن ژى بۆرين ، ژ سێ سالان درێژتر . بێلۆكا ئەسكەرێ مە هێ نەهاتيە ، هاتنا وێ « ئەهتوبەهتە » لێ هەكە هات ژى ، كى نابێژە كو نەفرێن وێ نەژمە برچىتر و رەبەنتر ن ؟....

دەردێ مە جاميرى و مرۆڤاتىيا حكمەت ئەفەندىيە ، ژدل حەژ ئەسكەر دكر ، لەو نەفەران ژى شيرەت و گۆتنێن وى نەدشكاندن و سەرێن خوە بۆ ڤێ رەوشا رەش دچەماندن ... گەلە رۆژان ئەسكەر بێ « تايين » دما ، رۆژا خێر و بەرەكەتێ شۆربەكا رۆن بوو « ئاف ژ رو ، بەرەكەت ژ خودێ » ، كەفچى ل بنێ لەگەنێ دگەراندن تشتەك نەدكەتێ ، رەنگێ خوە ژى ژ رەنگێ هەر گيايێ هشكێ ژ چۆلێ دكرنێ دستاند ... ئوسا ژى نەفەرێن ژار كێف و سەما ژێرە دكرن . ڤێ

خوارنا كەس نەديتى گەلە پەستە و سترانێن خەمۆكى و كەنۆكى ژ چەپۆكێ جزيرى چێدكر :

هەى وەرنێ وەرنێ وەرنێ
ئەسكەرنۆ وەرنێ وەرنێ
هەى وەرنێ وەرنێ وەرنێ
گەدەنۆ زۆ بگەهنێ
ژەهرا سەرێ مارانە
خودێ بكى دەرمانە
لاونۆ وەرنێ سەيرانە
گەدەنۆ زۆ بگەهنێ
ڤەرەشانا كتكانە
خێرا سەرێ سولتانە
كەسێ نەخوت پۆشمانە
گەدەنۆ زۆ بگەهنێ
هەى وەرنێ وەرنێ وەرنێ
سێوينو وەرنێ وەرنێ
هەى وەرنێ وەرنێ وەرنێ
برسينۆ زۆ بگەهنێ

مە ئەو رۆژێن هشك وگران بكێف وسەما دبۆراندن ، مە خوە پێ دخاپاند و شەرێ مرنێ دكر ، بێلۆكا ئەسكەر ژى هەر نەهات و نەهات .. هنەك دبێژن نەهاتنا وێ چێترە ، وهنەك ژى دبێن هاتنا وێ چێترە . چونكى -بەلكى -كەدەك بوانرە هەبت .. چەپۆ چارێ ژ ئەزمانێ خوە ناكت ، ديسا وەك هەرجار درێژكر و گۆت :

- « بلا ئەوژى بێن ڤێ سەنتەنەتێ ببينن و ژڤى شەكرى بخون ... باوەر بكن ئەوژى نهو تاما دەڤێ خوە بمە خوەش دكن هەروەكى ئەم بهاتنا وان تاما دەڤێ خوە خوەش دكن « مشۆ وەرە جەم بابێ خوە »

هلما گرارەك وەك يامروڤا لە بوويە « خوونا سياهۆش » . تا ئێڤارەكێ ،
ئەو مەديت ژ نشكێڤە قەلەويزێ سەرێ ملێ گازی كر : « بزانن ئەو چ رەشە » ژ
دوورڤە ديار و بەر بكنارێ وە دلەزينت ؟ »

راستە ... رەشەك ديارە ؛ لێ ئەمێ چاوا بچاڤێن كو ژبێ خـوارنی و بێ
زوهمی تاری ببون بزانن چيە ؟ ... چاوەيشۆكی مە ب دووربينێ تەماشا كر و
گۆت :

- « مزگينیيێ بدنە هەڤ ، زەلامەكە و ل دەوارەكی سوارە ، ئان كەرە ئان
هێسترە ، لێ ئەگەر كەر بت ژی مينا هێسترەكیيە »

هنا گۆ دو ـ سێ « ئولچە » گەنمێ هێرايی ژمەرە ئانیيە . هنەك دی دگۆ
پۆستەچیيێ بيلۆكێيە .... چەپۆكێ تم حازر گۆت : « ه، كی : بلا ئەوبت ،
مانێ هەر بێ باج ژنێڤ لەپێ مە دەرناكەڤت »

سوارێ كەرێ گەور هات و سلاڤ كر : « سەلا،و ئەلەيكوم گەلی برايێن
ئەسكەر » .. چەپۆ سەرێ كەرێ وی گرت و گۆتێ :

- « وەی تو ب كەرێ خوەڤە سـەر سەرێ من و يێ هـەفت بابێ من هـاتی
سوارۆ ... ئەم لئەسمانا لتە دگەرن ، تول ئەردێ كەرەم دكی بـەر دەستێ
مە ... هەكە خودێ ددە نابێژە تو كورێ كی دێهلێيی ؟ »

كەرێ وی ژێ ستاندن و هەرە تو بخێر بچی ، هەرە لخوە مەكە شەڤ و
دەرەنگی ... مێركێ رەبەن ، بەلەنگاز و رێوی دەڤ ب لاڤان كر :

- « ئەمان يەمان ، ژبۆ خودێ ، ئەز مروڤەكی ژار و پەريشانم ، لسەر دارێ
دنيايێ ژڤی نێرەكەری ويڤەتر ئەز بير پێ نابم و من توخمێ دەوار نينە ، وبرايێ
من ژی مينا وە ئەسكەرە و ئەڤە دوكت سالە ئەم ژێ بێ خەبەرن ژی ...

نەهەرێ ، ڤێ لاڤەلاڤا وی نەسەر گرت و نەبەر ، قەستاندنێ ژخوە دوور
كرن ... دچوو دچوو ديسا لخوە دزڤری ، لێ كەسی نەدێتێ وەرە كەرێ خـوە
ببە ... تەنێ دلێ مەلايێ مە خۆجە ئەفەندی پێ شەوتیو گۆت :

- « بدن خاترێ خودێ ويێ من ، كەركێ بدنێ ، ئەڤە ئەز ، لشوونا كەرێ وی
من سەرژێكن بخون »

حكمەت ئەفەندی خوە ئەنراند وگۆتێ :« تو خودێ سەيدا ، مايێ خوەتێ
مەكە ، بلا دلێ تە بمە ژی بسۆژت ، ئەو يەكە و ئەم سەدن ، مەژی وەك تە دل
پێڤەيە ، لێ ئەم چ بكن چارە نينە ، ئەردێ مە هشكە و دەولەتا مە هشكتر »

مەلایێ مە پلمێ خوەکر و بدلێ شکەستیڤە بەر بچادروٚکا خوە چوو ...
چەپوٚ گازی خودانێ کەری کرو گوتێ :« تە دلێ مەلایێ مەژی ژمە هشت ، تو دچی هەرە ، تو نەچی ئەڤە ئەز هاتم تە ژی بینم بکم قەلی ـ قاورمە ، ڤێجا هەما هەرە لخوە مەکە دەرەنگی چێترە ، بشیرەتا خێرخوازێ خوە چەپوٚکێ جزیری بکە »

مێرك رەڤا خودی رەڤی ... نەفەرێن نیڤ مروٚڤ کەرێ گەور لئەردێ دان و سەرژێکرن ، زوٚ زوٚ پارچە کرن و لخوە لەیڤەکرن ، ڤرن سێزدە پشك ، هەر پشکەکێ ژ هەفت ـ هەشت نەفەرارە . سەرێ وی ژی ژ چار کەسانرە و کیر و هەردو گون و پارچەك . لەغەر ژی دانە مە چار کەسان ، لێ مە قیما خوە پێ نەئانی و گازندا خوە مە بر بەر دەستێ حکمەت ئەفەندی :
- « ئەفەندم ـ مەگوٚتێ ـ خودێ قەبوٚل ناکت کو ئەو سەرێ مەزن ژ چار کەسانرە بت و ئەڤ کیر و گون و پچکا چەرملاق ژی بوٚ مە چار کەسان بت ... باشە ، لێ تو ب وژدانا خوەکی ئەڤ وژدانە ؟! هەما بوٚ خودێ بێژە !! .. نێ نێ ـ هانێ برێنێ هەما ئەزمانێ وی تەنێ ژ ڤی کیرێ مە چێترە . دەهەما قەنە دوسێ پوٚستەك ریڤی ژی بدن مە .

حکمەت ئەفەندی خوە لمە مرێتوٚیی کر و گوٚت : « وژدان !!! .. وژدانا چ !! « ئوغلم » هەکە وژدان لدنیایێ هەبوویا ئان مابوویا ئەڤ جەنگ هلنەدخستن و ئەڤ بسەرێ مە ژی نەدهات و مەژی ئەڤ زور و ستەم نەدکر . ماکەنگی ئەڤ وژدانە ، مە کەرێ وی ژاری بداری زوٚرێ ژێ ستاند و کرە د زکێ خوەدە ؟ »

مام خدر ناڤەك قەفقاسی گوٚتنا حکمەت بڕی و گوٚت : ئەی خودا ، لباژاران خەلك و شێنی نانێ گەنم و گوٚشتێ بەرخان ، باقسمات و کوتلك و کادا دخون . ئەم ل ڤێ چوٚلا کەس نەناس ژبو چینیك گوٚشتێ کەر . و هرچان سەر و دلێ هەڤ دشکێنن . ما مرن ژی نەژڤی حالێ مە خوەشترە ؟ »
چەپوٚزانی کو دلێ حکمەت بڤێ گوٚتنێ شکەست ، ژلەو بەرسڤ ژجەم خوە دا : « هەی بابێ من ، مام خدرێ زانا ، ئەوێن خوارنێن خوەش دکەڕفن ، نەئێن وەك من و تەنە ، ئێن وەك مە ل هەر جی گوٚشتێ مشك و ماران ژی ڤێکا لوان هزرەتە ، پشتی کو سەو کتك هەوکرین .. بێژە « هنەك » ، مەبێژە « شێنی » ، شێنی شێنییە و هنەك چەند تەرەسەکن »

حکمەت ئەفەندی کێف بگۆتنا چەپۆ هات و دەلیڤا خوە دیت و لوان هەیتاند : « ڤی دەرگەهی داخن و ئێدی ڤەنەکن ، بزانن کو گۆتنا راست ( یاساقە ) ...

ئەڤ گۆت و هەر هات و چوو ، شێورا خوەکرن ، هلانین .

- دانین دۆڤك ژی ئاڤێتن بەرمە !!.. هێ نیڤ پژ مە راهێلایێ - بخون هەربخون - مە بهنا خوە پێ دەرکر ... باوەر بکن تا هنگێ هێژ مە خوارنا وەك وێ خوەش نەخواری بوو . تا نهو ژی کو تێ بیرا من ، خوەشییا تاما وێ تێ دەڤێ من ... چەپۆ ئەم راکرن گۆڤەندێ و کرە پەستە و ب ئاوازێ « لێ لێ کنێ » مە خوە لبەر هلاڤێت .. هنگێ ژنوو م زانی کو ئەم کورد ژهەمی خەڵکی ڤێ دنیایێ خوەگرتر و کەیفی‌ترن ، چونکی هەر تەنێ کورد بوون دیلان دکرن .

بخون بخون لێ لێ لێ
خوەش کەبابە وای وای
کەسێ نەخوت لێ لێ لێ
ئەو سەبابە وای وای

چاویشوکەك هەڤێرکی - تۆری - مە هەبوو هات و گۆت : راستە کو دبێژن « ڤۆنا تازی تەمبۆرێ دخوازی » ، یاراست دلێ من ژی دچتێ لێ ئەز چکم خودێ مالا خودانێ ڤێ جەنگا چەپەل وێران کێ ، ئەز کریمە وەك مرۆڤێ کنۆژ ، دبێژن « مرۆڤێ کنۆژ زۆ ناڕی دە زۆ برچی نەبێ » لازمە ئەم ژی ولۆ بکن .

حکمەت ئەفەندی - نە ژدل - کێفا خوە دیارکر و گۆت : « هەرچەند راستە کو ئێش و ژان لهەرجی هەیە و ئەم بێ دختۆر و دەرمانن ژی ، لێپا ماشەللا وەلێ ژی نەفەرێن مە هەمی ئازن ، تو دبێژی قەی بەلکی هەرۆژ سێ دان گۆشت و برنجێ « قەرەج داغێ دخون » .

چەپۆ دیسا چارە ژخوە و زمانێ خوە نەکر و گۆت : « ئەفەندم هەی ئەزبەنی ، ئەڤ گۆتنێن ڤالا مەتێر ناکن و دلێ مە ژی خوەش ناکن ، ما تە گوهـ لێ نەبوو چاویشێ مە ناڕی دە زۆ برچی نەبت ؟... یاقەنج ئەوە کو ئەم هەرن مەلایێ خوە هاش کن ئان ژبیرا تە چوو یە ؟

حكمەت ئەفەندى نەدزانى چ بكت و چاوا راگرت .. هەما گوٚت : سەر بەختێ كەرێ من بت ، تو ژمە هەميان چێترى ... چوون ... لێ چ بچن ؟! و چ ببينن ؟!... ديتن كو ئەڤە مەلايێ رەبەن چوويە بەر رەحما خودێ و بستكا گوٚشتێ كەرێ گەور وەك خوە دەست و دەڤ لێ نەدايى مايە ... حكمەت ئەنييا وى ماچ كر گوٚت :

— تە گەلە « ياسين و ئايەت » لسەر مرى و كوشتييان خوەندن ، ليٚكو تو بخوە مرى كەسەك نەبوو ئايەتەكێ بتەڤە بخوينت ... تە هەر دگوٚ « خوەزى جارەك دن بساخى ئەزل زاروٚزيچێ خوە زفريم و بسەربەستى وەك جاران خوەيتى ل زەڤيكا خوە و رەزكێ خوە كرى » لێ تو مرى چوويى و تە نەديت »

سالوخا مرنا خوٚجە بدەنگى چەپوٚل وێ شكەفتا دەڤێ گەلى دەنك ڤەدا :

— « هەى هێێێ ...... مەلا ژى سولتان خوەش ...... « فاتيحێ » بخوينن .

ژبل وى نوٚبەدارێ راسەرى دەڤى گەلى كەس نەما ، هەريەكى ژجهێ خوە قەستا چادروٚكا خوٚجە ئەفەندى كر . هنا « فاتيحە » دخوەندن و هنەك ژى ل بستكا گوٚشتێ كەرێ گەور وەرهاتن ... نەفەرەكى چللەك !!! راهژتێ و رەڤاند ... هەڤالێن وى ليپەى لەزاندن . چەپوٚ ژبنێ پێيا كر هاوار و قيرەك دا :

— « لاونوٚ بگەهنێ ... بگرن ... بەرمەدن ... ژێ بستينن .. دەست مەكنێ ، ئەزێ ژ رەحمەتى رە بكم خێر .

**ئەفەندم : ئەزبەنى**

**ياهێ : سپاس و ئافەرين**

**پيان : ترار ، تاس**

**قاقب : قازانا مەزن**

**گڤراندن : الاندماج المنسجم ، التفاعل**

**كوٚرفەلاقى : هەر تشتێ ژ نشكێڤە بكەڤى ددەستێ مروٚڤدە ، ئان وەك دبێژن « كەو ل دارى كەت ، نە دار ل كەو »**

**نيڤ پژ : نيڤ پژيايى ، نيڤ براژتى**

ژ خوه هەو : ژ خوه خلاس

ئاف ژ رۆ ، بەرەکەت ژ خودێ :

گـۆتنەکـا پێشیانـه یانی ئـاف ژ روبار و .... تد ، یانی خـوارنەکـا رۆن‌و کێم زاده ، چ ژ بـەلەنگازی و چ ژ کنـۆژی بت .

مشۆ وەرە جەم بابێ خوه : کورتە چیرۆکەك کـوردی‌یە ، یـانی ژ خوەرە خوەش دبێژی ، خوەش دکت .

خوونا سیاهۆشی : یانی پەیدا نابی وەك تو بێژی « شیرێ چۆچکێ ئان شاخێ هوشترێ .

ئولچە : پیڤانەك ترکی‌یە ، ژ دار و دەپـان چێدکن و گـەنم و جەو گلوس ... تد .. پێ دپیڤن ، تا بەری چەند سالەکا ژی هێژ مابوو .

پلم ، پلمێ خوەکر : رووێ خوه گەمۆر کر ، خوه ترش و تاڵ کر .

قەرەجداغ : چیاکی ناڤدارە لـدەڤەرا ئـامەد ، نـاڤێ وی د گەلەك ستران و داستان و سەرپێ‌هاتیاد هاتیـە و برنجێ وی مینـا یێ ئاکـرێ خوەش و ناڤدارە .

چیرۆك

# منو ..... تو

● احلام منصور ●

دوێنێ وەکـو ئیمرۆ ، هـەر وەکو سبـەینێش هەمـوو شتێك تێـكئـالاوە پەرژینەکەی جارانیش !!

یەکەم شەو هەر کە چاوم بە تۆ کەوت ووتم :

- **ئەزانی هیچ پەردەێ لە نێوانی منو تۆدا نی یە**
- پەردەییکی توولە ، دەتوانم بە پەنجە هەڵیگرم ، تارایە ..

- یەکەم شەوبوو بۆ یەکەمجار یەکترمان دۆزییەوە رۆیشتیت سەرنجەکانم بەدواتەوەبوون ، هاتیت سەرنجەکانت رێگە تاریکەکانتی تەمەنمی ڕووناك دەکردەوە ، ئێستایش نازانم لە کوێیت ، ماوی مردووی ؟ ڕەنگە ئێستایش هەردوو دەستت خستۆتە ژێر سەرتەوە ، یەکە یەکە ئەستێرەکان دەژمێریت قومێ لە جگەرەی لێوەکانت ئەمژیت و دووکەڵەکەی سینگت پڕ دەکاتو ، ناو بەناو بەکۆخەییێك ، بە هەناسەییێك ئاهی نامۆی ئەم چەن ساڵە ئەم چەن مانگو ، چەرخە دەرئەکەیت .

- **خۆتیت ...**

- وەکو خەوێکی دوور چاوەڕێم ئەکردیت لە ئاسمانەوە وەکو باران بباریتە سەر نێوچەوانمەوە ، بڕوام نەکرد لەپڕ ئەژنۆت دەشکێ جاران بەڕاکردن هەنگاوی خێرات دەنا چرکەچرکی دڵیشم چەن هەنگاوێ دوای ئەخستم ، هەنگاوەکانمان لەخاك تۆرا ملی خۆشەویستیمان بەرەو دەریاکە ناو ڕۆیشتین .

- خۆتیت .

- مووە سپییەکانی سەرتم پشکنی چەن تەڵە موویەکم ژمارد ئاوێنەی تەمەنم هێنا بەسەرنجەکانتو وتت .

- پیر بوویت .

- نەموێرا بە تاراکەم برینەکانت ببەستم .. دەمزانی خوێنت تك تك ئەکەوێتە سەربرینەکەمەوە .. جاران ، هێندە بێکەسو کڵۆڵ بووین بەچەشنێ نووکی قەڵەمەکانمان ڕستەکانی دووبارە دەنووسییەوە ، کەس نەیدەزانی بەیەکەوە دەگرین کەس نەیزانی بۆ تەنها خۆت لەمێژووی ژیانت تۆراویت .

### ئەڵێن : وشك بووینەتەوە !

ژیانیشمان زۆر تاریك بووە بڕوامان نەدەکرد کە مرۆڤین .. بەتەمای سبەینێ نەبووین بەجادە تۆراوەکاندا دەرۆیشتین لە ئاوارەیی زیاتر هیچمان نەدەدۆزیەوە ، نامۆیی ببووە تاقە هاوڕێیەکمانو لەبەر دەرگای بێدەنگیدا دادەنیشتین چاوەڕێی بووین سەرتاپا تەڕبووین ، بارانە نامۆکەیش تۆرایەوە دوو قۆڵی بەرەو دۆزەخی ژیانمان هەنگاو ئەنا پەراسووەکانمان تێکەڵی یەکتر بوونو لەژێر سێبەری نوێژەکانمان بەیەکەوە دەگریانو فرمێسکی تاوانەکانیشمان دەسڕییەوە.. نەکەی بتۆریێ پەرژین نابێتە دیواری

نیشتمان دەبرد ، نیشتمانیش هەموو شەوێ هەموو ساتەکانی دابەش ئەکردە سەرمان ، سەرمان قورس دەبوو ئاوێنەی رۆژگاریش پشتی لێ ئەکردین ، خۆم و خۆت لەنێو دەریای خۆشەویستی‌دا نووقـووم دەبووین ... خـرکەی خـوێنمان تێکەڵی دەریای خۆشەویستمان دەبوو ئاوێکی خوێناوی دەبووە ئەڵوەن و بەرەو گۆڕستانی شارەکەمان دەچوو .

* * *

بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر سەرتاسەری تەمەنم ، فرمێسکەکانم ئەوانەی کە باریونەتە سەر سینگتەوە یان ئەوانەی کە باریونەتە سەر سینگمەوە ببوورە ئەو فرمێسکانەی کە بەدزی‌و خۆیان لەتۆ ئەشاردەوە ، رێگەی نهێنیـدا ملیان ئەناو ئەڕۆیشتن .. ئا ئەگەر بتوانم هەنگاو بنێم‌و ئەو رێگە نهێنیانە بدوزمەوەو تیایان‌دا ون نەبین .. بەڵکو کلیلی دەرگای نهێنییکت بۆ بێنم ئا ئەو کاتە لام وایە « دەچوویت » ئەم ئەرکە قورسەت بـەجێ ئەهێنـاو پێش ئەوەی پـرسیارم لێ بکەیت‌و بلێی ـ بۆکوێ ؟ هەمیشە ئەتم‌نارد هەمیشە پێتم دەووت :

- بڕۆ .

توویش ئەڕۆیشتیت‌و ماوەییکی دوورو درێژت پێ‌دەچوو . شەرمت دەکرد بەدەست بەتاڵی بگەڕێتەوە ، ناچار دەبووی کلیلی دەرگای دەروونت دەخستە نێو مشتمەوەو دەتووت : فەرموو

لەپـڕ بێ‌دەنگ دەبـوویت‌و دەهاتیت‌و فـرمێسکەکـانت چاوەکـانتی جێ ئەهێشت‌و منیش ناچار دەبووم بیانمژم ، تامی فرمێسکەکانت لە تامی فرمێسکە وون‌بووەکانی خۆم نەدەچوو بەڵام ناچار دەبووم دڵت بدەمەوەو پێت بڵێم :

- هیچ جۆرە فەرق‌و جیاوازییێـک لەنێو فـرمێسکە سـویرەکـانت‌و فرمێسکـە تاڵەکانم‌دا نییە .

ناچار دەبووم درۆت لەگەڵ بکەم‌و فرمێسکی تـاڵ بە فـرمێسکی سوێـر بگۆڕم ، هیچ نەبێ گەشتەکەت .

دەشتدەزانی فرمێسکی تاڵ بە فرمێسکی سوێر ناگۆڕی تۆیش بۆ ئەوەی دڵم بدەیتەوە رازی دەبووی‌و بێ دەنگیش دەبووی کلیـلی ئەم بێ دەنگییـەی هەردووکمان باش‌بوو هەر لە نێوەی قاسەکانمان بوو ، بەبیرت چوو ئەو ڕۆژەی کە پێتم ووت : ڕێ بۆ ئێمە نییە ... شوێن بۆ ئێمە ... تەنیا لەسەر لاپەڕە ئەژین .

* * *

وا دیسانەوە شنەبا لاپەڕەکانمی هەڵدایەوە ... هیچ ڕۆژێ نەهاتەوە یادم داوای شتێکت لێ بکەم تەنانەت هەڵتم دەبژارد بۆ ئەوەی کراسەکەت داکەنیو لەسەر شاخێ بووەستیو پشتت بکەیتە لاپەڕەییێکی مێژوویی‌و منیش بە چەقۆ هەموو نووسینەکانمی لەسەر بنووسم یان بیکەیتە تابلۆیەك‌و نەخشەی ژیـانی خۆمی لە سەر بکێشم هەمیشە بێ دەنگ بوویت نەتدەووت بە ڕەنگی بەرد ، یان ئاو ، یان دەرخت ، یان شەو ، نەخشەی جیهـانت بکێشە ، منیش منێکی بێ ویژدان لەسەر شانە تابلۆکەت بە چەقۆ نەخشەی هەموو گووناهەکانم دەکێشا .. دەمسرپیەوەو دووبارە دەمکێشاو دەمسرپییەوە بێ دەنگ دەبوویت لە جیاتی من بەردە باران دەکرایت ، من « مریەم » نەبووم تۆیش « مەسیح » نەبوویت کەچی گووناهەکانم دەکردە بەرد دەمدایە دەستی ئەم‌و ئەو ، بەردە باران دەکرایت‌و خۆیشم لە دوورەوە تەماشاتم دەکرد .

**نەم دەووت :ـ بەسە وازی لێ بێنن**

ووردە ووردە خوێنی شانەکانت تێکەڵی ئارەقی ڕەنجت دەبوو ، دەتوانەوە ، وەکو باران دادەبارینە سەر قاچەکانت دەست نوێژت دەگرت‌و دووبارە لەسەر شاخە بەرزەکە دەگەڕایتەوە منیش ئارامتم دەبڕی‌و دیسانەوە بۆ ئەوەی بوارت بدەمێ سەرت ، نەخێر ، تەڵەموویێکی سەرم بکەمە دیـاری‌و بتبەخشمـەوە خێرا بـە بێ‌دەنگی دەڕۆیشتی سەر دەکەوتی‌و سەر لەنوێ منیش بە زمانی قەڵەمەکەم مێژووی شارەکەم دیسانەوە لەسەر تابلۆی پشت ئەنووسییەوە ، بۆ ئەڵوەن ڕێم خۆش دەکرد لەپڕ دەمارەکـانت ئەتـەقییەوەو ئـەڵوەنی خوێنت هـەزار لقی لێ دەبووەوە منیش لە جۆگەیێ مەلەم دەکردو دەم‌و چاووم دەشۆردەوە ، خوێنت خوڕ وەکو تاڤگەیێ لوتکەی شاخەکەی دەشۆردەوە ، تۆش لەپڕ وام ئەزانی بەر ئـەبییەوە یـان قاچـەکانت ئـەخلسکێ نەخـێر دەگـەڕایتـەوە چـەپـەڕییێکیت هەڵدەبژاردو دەگەڕایتەوەو سەر لەنوێ ڕاستەڕییێکت هەڵدەبژارد ، بەم هات‌و چۆیە نەم دەووت .

**هەتاوم ئەوێت .**

تۆیش دەبوویتە دەرختێ چۆڵەکە بریندارەکانی وڵاتەکەم لەسەر لقەکانت هێلانەیان دەکرد ، منیش کراسەکەم ئەدڕی‌و دەمکردە « نەزر » نەم‌دەتوانی سەرکەوم بە تاوانەکانم دەووت :

- ئا ئەم پەڕۆیە ببەستن لقەکانی بپێچن ئا بەم شێوەیە پاڵەوانەکانم لە ژێـر سێبەرتدا دەژیان منیش لاپەڕەیێکی ترم ڕەش دەکـردەوە ، لاپەڕەیێکی تـۆم ڕەش دەکردەوە ، خۆم هەر وەکو دەزانی لاپەڕەم نەماوە ڕەشی نەکەم ، ناچار دەبووم هەر کە گەڵا زەردەکانت ئەوەرێ ، یەکە یەکە کۆیانم دەکردەوە دەیانم خستە نێو داوێنم ، ئەیانم شاردەوە لەخۆم ، نـەم دەتوانی پـەنجەکـانمی بۆ درێژکەم نەوەك ووردو خاش ببنەوە لەنێو لەپەکانی دەستدا مانگ بە مانگ ساڵ بە ساڵ ڕۆژ بەرۆژ ، سات بە سات ، هەرچی گەڵای زەرد هەبوو بەسەر سەرمدا دەبارییەوە ، بە تۆزی بێ دەنگییت دەمو چاو زەرد دەبووەوە گەڵا زەردەکانیش دەبوونە فەرش ، بۆ خـۆم دادەنیشتم بییرم لەوە دەکـرد ئەمجـارەیان بـوچی هەڵتبژێرم ؟

* * *

خۆمم دۆڕاند وا ئەڵێن بێ دەربەست بووی بڕوا بوون و نەبوونت تێکەڵی یەکتری بوون بەلایانەوە . بێ دەنگ بوویت پرسیارت نەکرد ڕاستە ؟ درۆیە !؟

لەنێو ڕێی ڕاستو چەپ وەستای ، ڕاستم ڕاستم کردە چەپ چەپیشم کردە ڕاست هەردوو ڕێگەکەیشم لە ژێر قاچەکانت ڕاکێشـا ، هەنگـاوت بەرەو ڕاستو چەپ ئەنا نەخشەی هەنگاوەکانت تاوانەکانمی ئەسڕییەوە ، لەسەر یەك هەر دەمووت :- بۆ . تۆیش ئەڕۆیشتیت .. منیش داوی هەردوو ڕێم دەکێشا .. قاچەکانت نەدەخلیسکان ووردە ووردە پەنجەکانم بـەو دوو داوە پەنجـەکانی دەستی ڕاستم بـاریکە ڕێی چـەپم دەبەستـەوە پەنجـەکانی دەستی ڕاستم بەدوای باریکە ڕێی چەپم دەبەستەوە .

ئا ئەو کاتە کوێر دەبووم ئەو کاتەیش تیشکی هەتاو دەبووە ڕێت بۆیە وون نەدەبووی ئاوڕیشت نەئەدایەوە ، تیشکی هەتاوێکت ئـەهێنا ، لاپـەڕە زەردە وەریوەکانی تـەمەنت سـەوز دەبوون چـاوەکانم دەکـردەوە خۆم لەهـەشتێکا دەبینی ، ئا بەم شێوە ڕاهاتمە سەر گوناە زۆر جار بێ ئەوەی پرسیارێ لە لێوە ووشکەکانمەوە ببارێتە سەر زارت خێرا وەلامت دەدایەوە .

بێ ووشە ، بەبێ دەنگی دەمزانی ئەم جارەیش بۆم هەیە هەڵت بژێرم بۆ شتێکی سەیر .

* * *

لە کەناری دەریا دادەنیشم لە دوورو نزیکەوە تەماشای شەپۆلی دەریاکەم دەکرد ، درۆییکم دەکرد کەشتێك تۆیش دەتزانی و بێ دەربەست بوویت نەمدەووت توش ڕەشە بایێ یان زریانێ دەبیت نەهەنگ قوتت ئەدا ، ماسییە گەورەکان ئەتخۆن و پەراسووەکانتم بۆ دەنێرن ، یەکە یەکە بەردەکانم ئەژمارد یاریم بە قومو ریخ دەکرد پێم ئەووت بێسەوڵ بڕۆ ئەڕۆیشتیت حەزم دەکرد بەسەر دەریاکەدا . بڕۆم بێ ئەوەی تویّی قاچەکانم تەڕ بن ... نەم دەتوانی ، دەمزانی دەخنکێم و لافاوی درۆکانم ، شەپۆلی تورە بوونم ئەم سەرو ئەو سەرم پێ دەکات ئەڕۆیشتیت منیش لە کەناری دەریاکە چاوەڕێتم دەکرد ... ڕەنگی دەریاکە سەوزو شینو سپیو سوورو ڕەش دەبوو ... ڕەنگی سێبەریشم وەکو خۆی دەمایەوە پێش وەخت دەمزانی نهێنیی دەریا کلیلی وون بووە ، لە گیرفانمدا نییە ...لەپڕ ماسییە بچووکەکان ئەگریان ، دەمزانی کەشتیی درۆ فێلی لێ کرد و لە نێو دەریاکە وون بووی ، دەمویست فێری مەلەوانی بیت لەپڕ ماسییەکان بەرەو کەناری دەریاکە مەلەیان دەکرد دوو مراویان بۆ دەهێنام .

تەماشایانم دەکرد دەمزانی چاوەکانتە !

* * *

لەگەڵ هەموو باڵندەکانی گەردووندا باڵت دەگرت دەگەڕای دەگەڕایتەوە نەبوومە هێلانەت نەخێر هەرکە هەوڵت دەدا بە باڵەکانت نزیکم بیتەوە ، دەبوومە ڕاوچی بێ فیشەك تەقەیێکم لێ ئەکردی ، نەمتوانی ببمە هێلانە بۆیە هەڵتم بژارد بمنێژی ئەو کاتە کە جەستەم ئەخەیتە نێو گۆڕەکەت بەلێ ، پێت سەیرە کە دەڵێم گۆڕەکەت ئەگرێی بۆ چاڵێ ، بۆ گۆڕێ ، بۆ هێلانەیەك ... هەرکاتێك دەستت کەوت وەسیەتەکەم بۆ هەموو باڵندەکان داوای مەرگێکی خوێنم بۆ بکە .

* * *

لەنێو مانگو ڕۆژا گۆڕی هەیە ناونیشانی گۆڕەکە نازانین هەمیشە شەڕی لەسەر ئەکەین .. تۆ ئەڵێی :

- **ڕۆژیمنە ، گۆڕی منە**

منیش ئەڵێم :- **مانگی منەو گۆڕی منە ...**

لەسەر یەك گۆڕ شەڕمان ئەکرد ، هەمیشە پاڵم پێوە ئەنای و هەمیشە پاڵت پێوە ئەنام ببورە چاڵێ نەبوو ، گۆڕستان نەبوو گۆڕی هەردووکمان بوو ، نەماندەتوانی جەستەکانمان تیای دا بنێژین خۆی هەستی هەردووکمان ڕەنجی تەمەنمان ئارەقی نێو چەوانمان تیای دا زیندەچاڵ ببوو .. سەرمان هەڵگرت ، تۆ بەرەو مانگ و من بەرەو ڕۆژ تیشکی هەتاووت بۆ نەهێنام

تریفەی مانگم بۆ نە هێنای لەنێو تیشك و تریفەدا جارێکی تر زیندە بەچاڵ بووین .

چیرۆك

# گـــرێی دەروونـــی

زیاد پیربال قەساب
هاوینی ١٩٨٤

(سەرەتای مێژووی هەموو مرۆڤایەتی بەبرسێتیو خۆشەویستی دەستی پێ کردووە).

بوزا

ـ بەیانیە(ی) شنە بایەکی زۆر ساردی هەڵ کردووە، بەپێچەوانـەی هەمـوو ڕۆژێك زوو زوو لەخەو بەئاگا هات.. نازانێ بۆ ! ئایا لەبەر خەمو پەژارەو قوڕ بەسەریەکەی بوو.. کە ئاوای لێ کرد لەخەوی وا زوو بەئـاگا بێت ؟ یـان دەمەو بەیانیەکی زۆر سارد بـوو.. یان خـەونێکی زۆر ناخـۆش و ترسناکی دیبوو.. سەیرێکی ئەم سەربانو ئەو سەربانی کـرد، ژمارەیـەکی زۆر لە چوارپـایەیی ڕەنگاو ڕەنگی بینی.. برینی یادەکەی وەك ئیمڕۆو دوێنێ تازە بۆوە کزەیـەکی یەکجار گەورە بەسەر دڵی داهات، بیری لە خۆیو ئەم ژیانە تەنیایەو.. ئەم ژیانە کەساسیەی دەکردەوە ئەوە سەری بیستو چوار پایزە هەر تەنیایە.. تەنیایەکی بێ کۆتاییە... «هەمـوو شتێك جـووت دەبێت، ئەی بـۆ من هەر تـەنیام ؟!. جگەرەیەکی داگیرساند زۆر وورد بۆوە لە ژیانیکەساسی خۆی.. ژیانی منداڵ لەپڕێکا بەشاری ڕەشی پڕ یادگارە تاڵەکانی وەك ئیمڕۆی منداڵی گەڕایەوە، ز چۆن منالان بە دوایی ئەکەوتنو گاڵتە یان پێ ئەکرد...

ـ هۆی هالاڵە

ـ هۆی هالاڵە

بیر لەو ووشە نەگبەتیە دەکاتەوە کە لە منالیەوە پێی، لەناخەوە مردووە.. لەپڕ ڕستە ناسکەکەی دایکی لە گوێی زرنگایەوە وەك چۆن هەموو جارێك پێی ئەوت...

ـ کوڕم حەمە خەم مەخۆ.. با ئەو منالە زۆڵانە بۆ خۆیان ئاوا بڵێن.

ـ ئم، ئم

جگەرەیەکی تری هەر بەو جگەرەیە داگیرساندەوە.. خەمێکی قورس دڵی گرتوە.. لەپڕ بیرێکی ڕەش بۆ لا هات.. لە خۆیەوە برینی یادەکەی تازە بۆوە بوو بە خەمێکی گەورە.. بیری لە سەردەمی منداڵی و ئەو کچە جوانکیلەیەی دراوسێکەیان دەکردەوە.. کە ماوەی مانگێك بووماڵەکەیان هاتبووە دراوسێی ماڵی خۆیان.. هەموو بەیانیان و ئێواران لەبەر دەرگا، یان لەسەربان بەبیانووی جل هەڵخستن، حەمەی ئەبینی پێی پێ ئەکەنی و خەندەیەکی جوانی ئەهاتێ.. دەستی بۆ لای قژی بەرز ئەکردەوە لە جیاتی سەلامی نەهێنی حەمە زۆر دڵخۆش ببوو.. زۆر جار منداڵانی گەڕەکە بۆرەکەی خۆیان قسەیان بەو کچە دەوت، حەمە خەریك بوو شێت بێت.. حەمە زۆر جار ئاوا بیری دەکردەوە...

- «بۆچی لەو هەموو منداڵە بێ کەموو کوڕیانەی گەڕەکەکەی خۆمان منی خۆش دەوێ.. تەنها بەمنێك پێدەکەنێ.. ئاخ خوا ئەو ڕۆژە بگرێ کە دایکت لەماڵەوە باسی منی بۆ ئێوە کرد بوو..».

- توخوا گوناه نیە، ئەو منداڵە جوانکیلەیەی دراوسێمان، حەمەی ناوە زمانی نیەو لاڵە ؟!..

«تۆ لە جێگای خۆتەوە ڕاچەنی بووی و شڵەژا بووی.. ئاخ لەو ڕۆژە بەولاوە هیچ تۆم نەئەبینی، کەمنیشت دەدیت ڕات دەکردە ژوورەوە.. نەم ئەزانی بۆ !.. کەچی منیش هەستم بە هیچ هەڵەیەك و کردەوەیەك نەدەکرد کە بەرامبەرتم کردبێ.. یان کەموو کوڕیەکی ڕوخساریم هەبێت بەرامبەرت، بەلام لە دواییدا بۆم ڕوون بۆوە کەتۆ تاکو ئەو کاتە نەتزانیبوو کە من لاڵم وە مرۆڤێکی ئاسایی نیم.. بەلام بڕوا بکە دەروونی منو.. خۆشەویستی من بۆ تۆ گەورەترو پیرۆزتر بوو مرۆڤێکی ئاسایی.. ئەو بوو بووە گرێیەکی یەکجار گەورەی دەروونی من تاکو ئێستاش پێی دەتلێمەوە..»

دوو جووتە کۆتر برینەکەی حەمەیان تازە کردەوە.. بیری هاتەوە وەك چۆن ئەوە سەری دوو مانگە حەزی لەو کچە جوانکیلەیە کردووە بێ ئەوەی تاکو ئێستا هیچ پەیوەندیەك لە نێوانیان ڕوو بدات..

- «ئاخر چۆن ڕوو بدات ؟ ئاخ گەر بزانم ناوت چی یە ! باشە چۆن ناوت بێنم ؟ چۆن قسەت لەگەڵ بکەم ؟!.. دەترسم زۆریش دەترسم.. لەوە دەترسم گەر وەك چناری کچە دراوسێی منالیم زانیت لاڵم ئیتر سەیرم نەکەی.. ئێستا زۆرم پێ خۆشە کە سەیرم دەکەی.. کە دەست بەرز ئەکەیتەوە بۆم بە بیانووی قژ چاك کردن لە جیاتی سەلامی نەهێنی بۆ منی شەیدای تۆ.. ئەزانم حەز ئەکەی بێم بۆ لات و پێتی بڵێم «خۆشتم ئەوێ» بڕوا بکە منیش خەریکە شێت ئەبم.. بەلام چۆن ؟! ئاخ لەم یاسا نەگبەتیەیی ئێمە.. هەر لە وولاتی ئێمە ئاوایە.. کە کور

کڕنۆش بەرێتە بەردەم ئافرەت، هەر ئەبێ کوڕ بڕوخێ بۆ ئافرەت.. هەر ئەبێ کوڕ بچێ بۆ لای ئافرەت و پێی بڵێ.. خۆشتم ئەوێ.. بەڵام گیانەکەم گەر تۆش هاتی کە من هیچ وەڵامێکم نەبوو ئەوسا چی بکەم.. دووبارە ئەزانی کە من لاڵم.. ئاخ لە نەگبەتیم.. با هەڵسم پەلەکەم بەیانیە کاتی چوونە قووتابخانەیەتی، ئێستا لەماڵ دەردەچێ.. بابچم فریاکەوم.. باتێر سەیری دوو چاوی بکەم، ئەوچاوە زەردە پایزیانە.. ئەو چاوانەی کە چەند سەیریان بکەم لێیان تێرنابم..».
حەمە وەک هەموو ڕۆژێك نزیکی لای گەڕەکەکەی شۆخەکەی کەوتەوە.. گەڕەکێکی پڕ لە منداڵ و پڕ ئاژاوەو برسیەتی...

- «ئەوەتا لەسەری کۆڵانەکەی خۆیان دەرکەوت، ئەبێ ئاگاداری من بێ ؟.. ئەی چۆن ئاگادار نیە.. هەموو ڕۆژێك لێ ڕاهاتووە» ئاوڕێکی لە حەمە دایەوەو بەدەمیەوە پێ‌کەنی.. ووردە ووردە بەدوایا ڕۆیشت.. جار جارەش ئاوڕێکی دەدایەوە تاکو بەردەم قووتابخانەکەیان.. لەوێشەوە سەیرێکی تری حەمەی کردوو پێ‌کەنی، حەمە خەریك بوو لە خۆشیان باڵ بگرێ.. ووردە ووردە بەردەم قووتبخانەکەیانی جێ هێشت، بەدەم بیرو ڕۆیشتن و خەیاڵی عیشق و خۆشەویستی خۆیەوە.. خۆی لەبەر دەرگای ماڵەوە بینیەوە.. ماڵێکی چۆڵ و تەنهاو حەوشێکی بچووك و دار مێوێکی زڕو ژوورێکی پڕ لە ناخۆشی و پڕ لە یادگاری تاڵ و.. ژوورێك پڕ بێت لە کۆست و نەبوونی و دڵ ساردی، پڕ لە نەبوونی خۆشەویستی...
- «ئاخر بۆ ئاوا بێ بۆ ؟.. دایکە بۆ ئاوا زوو جێت هێشتم، تەنها تۆ بووی سەبووریم، هیوام، بەتووە مرۆڤ مابووم لەناو ئەم کۆمەڵە بۆگەنە، تەنها تۆ بووی کە هیوات پێ ئەبەخشیم لەم ژیانە..
. کوڕم حەمە گیان.. هیچ خەم مەخۆ شوکر بۆ خوا گەنجێکی جوانی سەد کچ سوپاسیشت دەکەن ئینجا شووت پێ ئەکەن.
بەڵام دایکە گیان ئەمزانی تۆ لەبەر سۆزو خۆشەویستی، دایکایەتیت ئەم قسانەت پێ ئەوتم، نەت دەوویست - هەست بەکەم و کوڕی خۆم بکە.. دایکە بەڵام نەئەبوایە کردگار تۆی تەرخان کردبایا بۆ نەمان.. ئاخ دایکە گیان بۆ ئاوا زوو جێت هێشتم چونکە تەنها تۆ بووی وات لێ کردم کە هیوام بەژیان هەبێت.. و نرخی مرۆڤ و خاك بزانم بۆ ئاوازوو جێت هێشتم دایکە گیان بۆ..».
دووبارە ڕستە ناسکەکەی دایکی هاتەوە بیر وەك چۆن پێی ئەوت...
- کوڕم حەمە گیان.. خۆزگە ڕۆڵە ملم بشکایە ئەو سەفەرەم نەدەکرد کەتۆ ئاوا هیت بەسەر هات لەم ڕووداوە نەگبەتیە.. خوا شوفێری ئەو ئوتومبیلە بگرێ.. ئەگینا ئێستا تۆش وەکو هاورێ کانت قووتابخانەت تەواو دەکرد.

حەمە جگەرەیەکی داگیرساند.. بەدەم جگەرە کێشانەوە بیری لەم چارە نووسە ڕەشەی خۆی دەکاتەوە.. وەك چۆن نەژیاوە وەك هەموو مرۆڤێکی ئاسایی ئەم جیهانە..

- «باشە وا دیارە گەر مرۆڤێك کەموو کوڕیەکی هەبێت ئیتر نـەژیت و کۆڕیـك هەڵکەنێت و بچێتە ناویەوە.. ئاخ لەم ژیانەی ئیمرۆی تیا دەژین..»

لەپڕ یادگارێکی تاڵی تری هاتەوە بەر چاوی.. وەك چۆن دایکی خوا لێ خۆش بووی چوو خوازبێنی کچێك بۆی وتبووی حەمە خوێنەوارە.. شەشی سەرتایی تەواو کردووە، ئەتوانێ لە شوێنێك ببێتە فەرمانبەرێك، وە هەندێك پارەی باوکە خوا لێ خۆش بووەکەشی بۆ ماوەتەوە.. ئەتوانێ ماڵ و منداڵ بەخێو بکات.. ئەوانیش ووتبوویان...

- ئێمە چۆن کچی خۆمان دەدەینە پیاوێکی لاڵ.. پەیوەنـدی نێوانیـان تەنهـا دەبێتە کاغەز و قەلەم.. ئەوە چ مێرد کردنێکە، بۆچی پیاو لە دونیا نەماوە ؟!.

- «دایکە گیان.. وا دیارە ئەوەی کەموو کوڕیەکی هەبێت بەپیاو نازانرێ لەم کۆمەڵە.. ئاخ دایکە گیان، خۆزگە منت نەدەهێنا بۆ ئەم ژیانە سەخت و ناخۆشە بۆ ناو ئەم هەموو خەڵکە دەروون تەسکە..».

خۆر ناوەڕاستی ئاسمانی حەمەی گرتووە.. لەگەڵ زەنگی کات ژمێرە کۆنە هەڵواسراوەکەی خۆیان ڕاچەنی.. لە بیرکردنەوە پچرا.. بەبیری هاتەوە، زۆری نەماوە ببێتە کاتی دەرچوونی شۆخەکەی، بیری کردەوە هەر وەك جاران بەڕێی بکات تاکو بەر دەرگای ماڵەکەیان حەمە وەك هەموو ڕۆژێك لەسەر هەمان بەرنامە بەردەوام بوو بەدەم خەیاڵی خۆی و خۆشەویستەکەی و جگەرە کێشانەوە.. خۆی لە سووچێکی ئەو بەری قووتبخانەکەیان بینیـەوە.. ڕووخساری پـەشۆکـاوە، چاوەڕوانی ئەو چاوانەیە کە خەون و خۆشی هیوا و ئاواتی خۆی تیا بەدی دەکات...

- «ئەوەتە، ئەبێ باسی من نەکات بۆ هاوڕێکانی ؟!..»

سەیرێکی حەمەی کرد وەك هەموو جارێك.. هاوڕێکانیشی دەسیان کرد بە پێکەنین...

- «کێ ناڵێ گاڵتەم پێ ناکەن..؟ ها، نا بڕوا ناکەم چۆن.. ئەبێ پاش ئەو هەموو ماوەیە پێم ڕابوێرێ ؟ نا. نا چۆن وا ئەبێ..».

ئاوڕێکی تری لە حەمە دایەوە و خەندەیەکی جوانی هاتێ، وورده وورده نزیکی ماڵەکەی خۆیان ئەکەوتەوە.. دووبارە وەك هەموو ڕۆژێك حـەمە بـەدڵ ساردی گەڕایەوە ماڵە بێ نازەکەی..

ئێوارەیە و خەمێکی قورس دڵی حەمەی گرتووە.. بەدەمجگەرە کێشـان و پیاسەی شۆستەکانی دووری شار، حەمە خەیاڵی ڕۆیشتبوو.. بیری لەم ژیـانە

تەنیاییەو لەم ژیانە کەساسیەو ئەم چارەنووسە ڕەشـەی خۆی دەکـردەوە، بەدەم خەیاڵەوە بەسەرەسم لە بەردەکانی سەرشەقام هەڵدەدا.. لەپڕ لە گەڵ هۆڕنی ئوتومبیلێکی کوڕی کابرایەکی خوا پێداو.. خەیاڵەکەی پچڕا.. ڕاچەنی، بە بیری هاتەوە وەك چۆن ئەو کوڕە قۆزە پێست سپیە، وەکـو ئەبـوو بردیـان بۆ دەرەوەی وڵات، ئێستا چاك بۆتەوە.

«خۆ ئەویش وەکو من بەڕووداوی ئوتومبیل ئاوای بەسەر هاتبوو.. ئەی چۆن چاك بۆوە ؟.. ئاخ لە نەبوونی و هەژاری..» جگەرەیەکی داگیرساندو ئەرمە کۆکەیەکی هاتێ.. بەدەم بیرکردنەوەوە بە بیری هاتەوە.. وەك چۆن مرۆڤ لەبەر تەنیایی.. خۆشەویستی بۆ پشیلەیەکی کزو برسی دەچێت.. ئەو پشیلەیەی کەوا کوڕی کابرایەکی دەوڵەمەند قێزی لێ دەکاتەوەو دەڵێت ئاوە گڵەو پیسە.. لە پڕ شانی بەر شانی ئافرەتێ کەوت.. ڕاچەنی.. نەیتوانی چی بڵێ، باشە چی بڵێو چۆن ؟ بەدەس و چاو داوای لێ بووردنی لە ئافرەتەکە کرد.. کەچی ئافرەتەکە بە دەمێکی زۆر کراوەوە ووتی...

- خۆ ئەو خەڵکە دەڵێی کوێرن.

ئەویش بەشەرمەوە ملی ڕێگای گرت بۆماڵە بێ نازەکەی، وەك کۆلیتێك دیار بوو لەناو ماڵان.

شەوەو حەمە خەمبارە زۆر بێزارە لەم ژیانە سەختەی کە تیایە دەژی.. بە دەم سەیر کردنی ئەستێرەکانی شەوەوە لەسەر جێگا شڕەکەی پاڵ کەوتووە.. بەدەم بیرکردنەوەوە خەیاڵی ڕۆیشتووە...

- «ئەوە بووە سەری دوو مانگ بوەچی ؟! لەوانەیە ئەویش قەڵس و بێزار بووبێ لێم.. ئێستا لەوانەیە بڵێ بۆ نایێ پێم بڵێ «خۆشم ئـەوێ‌ی» بەڵام گیـانەکـەم، چۆن ؟.. چی بڵێم، دەترسم گەر زانیت لاڵم سەیرم نەکەی.. نا باهەر ئاوا بێت توخوا، ئەگینا گەر سەیرم نەکـەی، گەر پێم پێ نـەکەنی.. گـەر دەست بەرز نەکەیتەوە بۆم لە جیاتی سەلامی نەهێنی ئەمرم.. با پەیوەندیمان هەر ئاوا بمێنێ نەوەکا ڕاکەی ئاواش هەر خۆشە تو خوا..».

بەدەم بیر کردنەوەیەکی زۆردا.. خەریك بوو شێت بێت، نەیئەزانی چۆن بتوانێ وا لەو کچە بگەیەنێ کە خۆشی دەوێت، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر بڕیاری دا کەوا لە پارچە کاغەزێك دا بۆی بنووسێو.. بیداتە دەستی دووبارە لە دوایی‌دا دەزانێ لاڵە هەر ناخۆشە و ئیتر سەیریششی ناکا، ئەی ئەوسا چی بکا.. ئێستا هیوایەکی بـەوەوە هەیـە ئەوسـا هیوای بـە چی بێ.. زۆر وورده بووە بیـری دەکـردەوە لەم گێرەو کێشـەی دەروونی خۆی، لەپـڕ ڕستەیـەکی کـوڕێکی ڕۆشنبیری هاتە بیر...

- خۆ هەموو کچێك یەك دەروون و یەك جۆرنین !. «خۆی لەوانەیە ڕاست بێت، بۆنا بۆی دەنووسم لەپارچە کاغەزیکا.. بەڵکو گەر منی خۆش بوێت بە هەموو جۆرێك ڕازی دەبێت.. گەر بشزانێ کە من لاڵم و مرۆڤێکی ئاسایی نیم.. لەوانەیە لای شتێکی زۆر ئاسایی بێت..».

بەدەم سەیرکردنی ئاسمانی شەوو ئەستێرە دوورەکانەوە حەمە وورده وورده چاوانی بەسەر یەك کەوتن، وەك بەردێکی زۆر قورس و گران کەوتە بن گۆمی خەوێکی قووڵ. بەیانی لەگەڵ گزنگی ڕۆژدا حەمە بە ئاگا هات.. لەسەر هەمان بڕیاری خۆی ماوە.. بەدوای کاغەزێك و قەڵەمێكدا گەڕا لەناو سندوقە کۆنەکەی کاتی قووتابیەتی.. لەپڕ کاغەزێك و قەڵەمێکی بەر دەست کەوت، بە دەست و پلیکی زۆر لەرزۆکەوەتیایا نووسی «خۆشم ئەوێ‌ی گیانەکەم».

حەمە ئێستا لە سەر ڕێگای هات و نەهاتدا وەستاوە، دڵی حەمە ئەو دڵە بێ نازەی بەبێ ئارام لە لێدانە.. زۆر بە پەلە.. نازانێ بۆ، لەپڕ شۆخەکەی وەك هەموو ڕۆژێك لەسەری کۆڵانەکەی خۆیانەوە دەرکەوت وورده وورده نزیکی حەمە ئەکەوتەوە.. دڵی حەمەش وورده وورده لە لێدان زیاتری دەکرد.. خەریکە حەمە وا ئەبووریێتەوە، خەندەیەکی کەمی هاتێ و سەیرێکی حەمەی کرد.. حەمە تۆزێك هێور بووەو هەستی بە شتێکی زۆر سەیر دەکرد، ئەویش ئەیزانی ئیمرۆ حەمە تۆزێك ڕەنگ و ڕووی گۆڕاوەو کاغەزێکی بچووکی لە دەست دایە، نزیکی کەوتەوە.. حەمە دەستی درێژ کرد بۆی، شۆخەکەشی وەستا سەیرێکی ڕەنگ و ڕووی حەمەی کردو بە پێکەنینەوە.. یەك دوو هەنگاو نزیك کەوتەوە.. کاغەزەکەی وەرگرت، بەشەرمەوە.. خوێندیەوە تۆزێك وەستا.. سەری ڕەزامەندی نواند لەپڕ ووتی...

- تۆ ناوت چی یە ؟

حەمە تێك چوو.. زۆریش تێك چوو، ووتی...

- ك . ح . ك . ح

- چی مانای چی ؟! مانای ئەوەیە تۆ لاڵی.. بۆ گەنج نەماوە لەسەر دونیا ؟

بەدەمێکی پڕ لە شۆڕشەوە حەمەی ڕیسوا کرد، حەمەش دایە پرمەی گریان، دووبارە بەدڵ ساردی گەڕایەوە ماڵە بێ نازەکەی و ساردو سرەکەی.

ئێستا پاش ساڵێك حەمە بێ هیوایە و بێ ئاوات ئاخۆ کچێك و هیوایەکی تر.

چیرۆك

# نامـــــۆ

نووسین
دانا علی سعی
سلێمانی ـ ٩٨٥

هێشتا لەگەڵ کازیوەدا دەستەویەخە بوون، گرمەگرم کارگە کەوتە گەڕ..
پەلە هەورێکی ڕەش ئاسمانی کارگەکەی تەنی.. بۆنی نەوت و گاز دەم‌ولووتی
هەمووتانی پڕکرد.. هەراوهاواری کرێکارەکان وەك چەخماخەی سەرەتای
بەهارێکی تەڕ، بەناو گرمەگرمەکەدا ڕەت‌دەبوو.. هەزار سمایل لەپاڵتا بەدەستی
باوکێ سەرببڕدرێ پێی‌نازانی‌و لایەکی ڕەحمەتی لێ‌ناکەیتەوە.. مام‌کەریمیش
پشتێنە سورمەیی‌یەکەی لەکەمەر توندکردووەو بەخۆی‌و خاکەنازەکەیەوە وەك
حەوت شەو حەوت‌ڕۆژ ئێشکگر بووبێ‌و خەو لەچاوانی نەکەوتبێ گێژوشەکەت
دەچوو.. تۆیش بەهێمنی چاوەکانت لەدیمەنەکە بڕیوەو لەگەڵیادەکانتا
جیهانێکی تایبەتیت خولقاندووە.. ئەم کابراسادەیە لات‌بووەتە چەند ماددەیەکی
سەرسامکەرو لەتاقیگەی بیرو لێکدانەوەتدا دەیهێنی‌و دەیبەی.. بۆ دوومانگ
ونیو دەچێ پێکەوەن.. زیاتر لەپانزە ساڵە لەم‌ئێشەدایت وبەهەزاران
خەڵکی جیاوازت ناسیوە، بەڵام کەسیان وەك مام‌کەریم لەژێر تیشکی
سەرنجەکانتدا بێ وەڵام نەماوەتەوە.. ڕۆژی چەپکێ پرسیاری بێ‌وەڵام‌لە
بانیژەی مێشکتدا کەڵەکەدەبن.. چەند سەیری دەکەی سادەوساکارە.. کەدەم
دەکاتەوە دڵەبچکۆلەکەی دەکاتە مشتتەوە.. کەچاوەکانیشی هەڵدەهێنێ جیهانێ
سەرنجی خۆشەویستی میهرو پاکی تیادەبینی.. بەڵام ئەوەی تۆی لەگێژاوی
بیرکردنەوەدا خنکاندووە. بۆئاشنانابێ‌و تادێ کێوی تر دەبێ ؟..

یەکەم ڕۆژی هاتنی مامکەریم وەك ئێستە لەپێش چاوتە.. یەك پارچە نەزاکەت وڕێزبوو.. بەلای هەرکەسێکدا تێدەپەڕی دەستەکانی دەگوشیو یەك هەزارجار بەقووربانی دەبوو.. تەنانەت کرێکارەکانی هاوڕێی بەچاوی بەڕێوبەرەوە تەماشادەکرد.. بگرەزیاترو گەورەتریش.. لەئاست برغوو پارچەئاسنەکانیشدا ڕێزو ستایشی خۆی دەنواند.. خۆگەر یەکێ سلاوێکی لێبکردایە وەك برای حەوپشتە دەبووە کلۆیەكبەفرو لەنێو دەستە گەرمەکانیدا دەتوایەوە.. زۆلێەتی یەکەی ئەحەی فیتەرو شەریفی سایەق هەردوو دەرکیان بەمەکردوو بووە ماددەی پێکەنینو ڕابواردنیان.. ڕۆژی پەنجاجار سلاویان لێ دەکردو ئەویش هەمووجارێ لەجاری پێشووتر گەرمترو سووتێنەرتر وەلامی دەدانەوە..

دلسۆزیەکەی چووەتە ڕادەی بێئەدەبی.. هەموئیشی کارگە بەئیشی خۆی دەزانێ.. لەهەموو کارێ خۆی هەلدەقورتێنێ.. لەشێکی سووكو زمانێکی شیرین.. ئامادەیە لەجیاتی پانکە باوەشێنی کرێکارەکان بکات.. لەدابەش کردنی کار هیچ نازانێو خۆی بەلێپرسراوی هەمووکارەکان دەزانێ.. چەو تێکردنو قیرکۆکردنەوەو برغووبەستنەوەو سازکردنی ئاوی ساردو گسكدان بەپیشەی ڕەوای خۆی دەزانێ..

یادی چوارهەم ڕۆژی هاتنی لێوەکانتی ترازانو قاقایەکی لە زارت دەرپەڕاند.. لەژوورەکەی ئەحەی فیتەرهەشت نۆیەك کۆبوونەوەو قسەی زلتان دەکرد، لەنا کاو مامکەریم خۆیکرد بەژووردا و پارچە ئاسنێکی قوورسی رزیوی بەدەستەوە گرتبوو، وەك ڕۆنی لەدیزەیا دیبێتەوە، ئازایەتی خۆی پێشان‌دەدا کە چۆن لەدەشتەکەی خوارکارگە دیویەتیو نەیهێشتووە بەفیرۆ بڕواتو هێناویەتیەوە. ئێوەش هێندەی ماندووبوونەکەی ئەو ماندووبوون لەپێکەنین، ئەمەبووە باسو نوکتەی هەفتەیەکتان.. یانبابلێین هەفتەیەکیان.

هێشتا مانگێ بەسەر هاتنیدا تێنەپەڕیبوو، یەك پارچە کرێکارەکان ـارەزاییان بەرامبەر مامکەریم دەردەبڕی.. هەموو لێی بێزاربوون.. خۆهەلقورتاندنو لێپرسینەوە لەکاری ئەمو ئەو بەتەواوی ناشرینی کردبوو ەپێش چاویان.. کەبووە مانگو نیوێك کار لەمەترازاو گەیشتە لێپرسراوان ێەندازیارو بەڕێوبەری کارگە.. سکالای کرێکارەکان لەگرم وهوڕی کارگە لندتربوو.. ئەمەبووە هۆی سەوزبوونی ڕقوکینە لەنێوان مامکەریمو ـریکاراندا..

بەلام تائێستا تۆ هەرتەماشاکەریکیو هیچیتر.. هەردوولا بەڕەوا دەانی.. هێندە سەرنجی مامکەریمت داوە لەخۆت باشتر دەیناسی.. خۆیشت

لەڕاستی یەکانی سەرومەسەلەکە گێل ـ کەی..ووریای.. بەهێمنی سەرنجەکانت بڵاودەکەیتەوەو بەبەرڕۆشناییان دەخ یت.. گلۆلەیەك یادی ڕابدوو دواڕۆژێکی چاوەڕوان‌نەکراو پێوەری مەسەلەکەیە لای‌تۆ.. هەرگێز دانیشتنەکەی ئەو ڕۆژەی مامکەریم‌و قسەکانی لەیاد ناکەی.. ووردو درشتی ڕووداوەکانی ژیانی‌و بەسەرهاتەکانی کردە چیرۆکێك‌و خوێندی‌یەوە.. باسی خێزانە هەشت کەسی‌یە‌ـ ـکەی‌و ژیانە ساکارەکەی.. کاتێ خاوەنی ڕەزو باخ‌و دێبەربووە، وەك باسی دەکرد پاشایەکی بێ‌سەربازبووە.. پاش‌ئەوەی.. ئێستایش..؟! مەگەر هەرتۆبزانی ئەم دڵە بریناری مان‌کەریم چەند بێ‌فێل‌و پاکە.. ڕووداوەکەی دوێنێ لەنێوان تیشکی سەرنجەکانت‌و مامکەریمی لانەتەریودا وەك شاخ قووت بۆتەوە.. گەر چاوەکانت هێندەی قەوارەی مامکەریم نەسمێ هەرگیز بەدی‌ناکەی.. مافی هەموو خەڵکی کارگەو مافی مامکەریم لەتەرازووی لێکدانەوەتدا وەك یەکەو قوورس‌و سووکی تیابەدی ناکەی.. ئەوان ڕەوان یان‌ئەم.. دەمارەکانی مێشکت گرژکردەوە.. زیاتر.. زیاتر.. چاوەکانت نووقاندو سەرەتۆزاوی یەکەت چەندجارێ هێناوبرد.. بەرگەناگری.. وەك شریتێکی تۆمارکراو ڕووداوەکەت هەڵکردەوە، بوویتە تەماشاکەرێك‌و چاوەکانت تی‌بڕی.

لەگەڵ شەپۆڵی گرەی نیوەڕۆدا کرێکارەکان کۆمەڵیان بەستووە.. نزیکەی نیوەی خەڵکی کارگە لێك‌ڕژاون.. هەرکەسە فریای ئەوە دەکەوێ چەند ووشەیەك بکاتە ڕستەیەك‌و دەری‌پەڕێنێ، دەنگە دەنگ‌و لۆغانێکە بووەتە ئەوڕۆژەی قەرەوەیسی تیا کوژرا.. لەلای چەپی کرێکارەکانەوە کاك‌هوشیاری لێپرسراو بەخۆی‌و چاویلکە ڕەشەکەیەوە بەرەوڕووی کرێکارەکان بەهێمنی هەنگاوی‌دەنا.. مامکەریمیش لەراستی حەشاماتەکەوە، هەرچاوی بەودیمەنەکەوت بەهەڵەداوان خۆی‌گەیاندە شوێنی ڕووداوەکەو لەنزیکەوە چاوەکانی زەق‌کردنەوەو گوێکانی هەڵخست.. پاش ئەوەی جەنابی لپێرسراو لەباسەکە گەیشت، ئەیویست بەدەنگە ناسکەکەی هەراوهاوارەکە کپ‌بکاتەوە.. (کاکە لەمەوداو خۆم سەرپەرشتی چێشتخانەکە دەکەم.. ئەم جۆرە گلەییانە دوایی‌دێت.. دابەشکردنی خواردنەکەیش هەرخۆم چارەسەری دەکەم.. جارێکی تربەم‌جۆرە دووبارەنابێتەوە..) وەستاعەباس بەدەنگێکی بەرز وەك ئاوبەئاگرا بکەیت دەنگەدەنگەکەی خامۆش‌کرد.. کەوتەباس‌کردنی کەم‌وکوڕی لەخواردنەکانداو چاودێری نەکردنی پاك‌وخاوێنی.. پاشان گلەیی‌کردن لەلپێرسراوان کەگوایە لەسەرچاوەوە مەسەلەکە لێل‌وناديارە.. ئەمەیش سەری مەسەلەکەی بۆچەند بابەتێکی‌تر ڕاکێشا.. ئەمەیان‌نا.. ئەوەیان‌وا.. لەبەرچی وابێ.. بووەدرێژدادری‌و هێنان‌وبردن.. لەناکاو مامکەریم وەك مووی‌لووت

هاتەنێوان هەردوولاو دەستیکرد بەڕاوێژکردن.. (کورەعەیبە.. کەیخواردن ئەوەدێنێ.. هەر شورەیی‌یە لەسەر خواردن پیاو دەنگی‌دەربێ.. باوکم ئەوەشمان ناوێ‌وزیادە.. لەمڕووە هەر کەسە بابۆڵەیەك نان‌و هەرچی خوادابووی لەگەڵ خۆیدا بیهێنێ‌و لێرەبیخواو تەواو...).

وەك شەقێ لەتۆپە خڕەکەی ڕۆژ هەڵدەیت‌و بەودیو زەوی‌دا گلۆری بکەیتە، تروسکایی لەچاوی کرێکارەکاندا نەما.. چۆن ئەمان پووشووبن‌و قسەکانی مامکەریمیش ئاگر، هەموویانی گرتێ‌بەردا.. لێشاوێ قسەی ساردو سووك‌و ناشرینیان بەسەر مامکەریمدا ڕۆکرد.. گەر کۆمەڵێکیان ترسی خوایان لەدلدا نەبوایە ئەوا دووان سیانێکیان خوێنیان دەکردە کاسەو بەونوێژی نیوەڕۆیە وورگیان ڕائەدا..

لەوەدەچێ هەزارجاری تر ئەمشریتە هەڵکەیتەوە، ناتوانی‌ئەم‌ئەرازووە بەلایەکدا بخەی.. دووهاوکێشەی هاوسەنگ‌و وەك‌یەکن.. کابرایەکە لێی نازانێ‌و کتوپڕلەم ڕێ‌وڕەسمە ناگات، گۆڕانێکی خێراو بێ‌بنچینەیە.. ئەوانیش وەك لەچاوی مامکەریمەوە دەبینرێن نەمردوون لەبرسا، مافێکی ڕەوایەو دەبێ وەرگیرێ.. ئنجاوەرە ئەم دووخێڵە لێکدی بگەیەنە.. دووجیهانی تایبەتی‌یەو لەمێشکی تۆوا ئاوێتە نابن.. هەردووکیان جێ‌وڕێی تایبەتی خۆیان دەوێ.. گەربنەمایەکی ڕاست بۆ مەسەلەکە نەبینی‌یەوە، تۆیش دەبیتە بەرەی‌سێ‌هەم.. بەلام‌وەك دەردەکەوێ مامکەریم دەبێتە مەرەکەی بری‌سمایل. ڕووداوەکان شانۆیەکەو لەپێش چاوەکانتدا بەددەوامە.. وەك گوێز ڕووداوەکان دەشکێنی‌و کاکڵەی هۆکانیشی دەردەهێنی.. گرنگ ئەوەیە وێنەکان وەك‌خۆی ببینی.. ئەمڕۆ خەریکە وێنەی ئەوکابراسادەیە ڕووناکی چاوەکانت‌بەشی‌نەکات.. سەرنجەکانت وەك سێبەر لێ‌ی‌جیانابێتەوە هەمووشتەکان بەئاشکرادیارن..

مامکەریم نامۆیەو ئاشنا نابێ.. تادێ چاوەکانی مۆڕترو سیمای ناشرینتر دەنوێنێ.. ئەوخەڵکەی خۆشی ویستن‌و خۆشیان دەویست کەمبووەوە.. ئێستا بی‌کەسە.. بێ‌ئاشنایە.. جیاوازی‌یەکی گەورە لەنێوان خۆی‌و ئەواندا بەدی‌دەکات.. وەك دووشاخ لەنێو جامانەشڕەکەیەوە دەرهاتبێ واخۆی‌دەبینێ.. هەروەك باڵندەیەکی بێنەوا دەخولێتەوە.. ڕقی لەهەموو شتەکان‌دەبێتەوە.. ڕقێکی توورەو ترسێنەر.. بەهەمووشتێ نامۆیە، تەنانەت بەخا کەنازەکەی دەستیشی هەرنامۆیە.. ئەمڕۆ ڕابردووی بووەتە خوێن‌و دڵە کەولکراوەکەی تەڕ دەکاتەوە.. داهاتووشی حەزێکی پیرۆزەو لەدۆزەخی خەمەکانیدا تەواوەتەوە.. هەموڕۆژێ دڵەبچکۆلەکەی چەپکێ خۆشەویستی‌و حەزو زەردە دەچنێ..

مامکەریم ئێستا دووکەسە.. دوودیمەنی جیاواز لەسیمایدا خۆیدەنوێنێ.. مامکەریمی مسۆگرو ڕازیو بەختەوەر بەژیانێکی ئاسایی‌وگران.. لەگەڵ مامکەریمی کزۆڵو کابرایەکی نەفرەت لێکراوو بێزارو قێزەوە.. ئەڵێن بەرد لەشوێنی خۆی سەنگی‌هەیە.. ڕاستە.. ئەمڕۆ مامکەریم واهەست دەکا سەنگی خۆی‌لەوێ جێ‌هێشتووە.. ڕۆژبەڕۆژواری لاوازتردەبێ‌و ڕیوەڵەتر خۆیدەنوێنێ.. ئەمەیە ئەو ڕاستی‌یە پیرۆزەی تۆ لەسەرو شتەکانەوە بەدییان دەکەیت.. بۆیە لای‌تۆ مامکەریم لەوە گەورەترە کەدیارە.. تۆ سەنگی ڕاستەقینەی شوێنی خۆی لەتەرازووی هەڵسەنگاندنتایە.. ڕەوشت‌و سیفاتە سادەکانی مامکەریم ڕێ بەچاوەگێلەکان دەدات خەرمانێ تانەوناتۆرە بەدیبکەن.. بەلام گرنگ چاوەکانی تۆیە شتەپیرۆزەکانت لەلانەڕەوێتەوە.

# بەدامێنی شاخێکەوە

أحمد سید علی بەرزنجی

لە وەرچەرخانێکدا بۆ لای چەپ وەك گابەردەکەی لایەوە تل بداو بەسەریدلبێ ئاوا تابۆی کرا قەلەمبازێکی داو لە تولەرێگاکەوە بەرەو ئەوبەر خۆی ئەمبازی پەلی دارەبەنێك کردو وەك نێچیرێکی ساردەوەبوو یەك دوو جار بەپەلەکەوە ئەمسەرو ئەوسەری کرد، دەستی بەرداو لە ئاستی خۆی رەپ کەوتەوە سەرزەوی، لە جێی خۆی چوار مەشقی دانیشتو یەخەی مراخانیو کراسەکەی ترازند ، فێنکی‌یەکی خۆشی دای لەسنگی، قایشەکەی پشتی بە دوو کون بۆ پێشەوە شل کردەوە، ویستی بە پشتا راکشێ، بەلام:

ـ نەکەی لە هیچ جێ‌یە ئەمین بی، وەك ماران گاز لە خشەی مارو مێرو سڵ کەرەوە، خۆت مەدەرە دەست رێکەوت.

دەستە سرەکەی هێشتا تەڕی ماوەیە لەمەو بەری پێوە مابوو کە لەسەر کانی خەیاران لامل و ناوچەوان و لاجانگی پێ تەڕکرد. کردی یەوەو بە لەپی دەستی هێنای بە ڕویدا، نەی دەزانی ئەوە چی بوو لەپڕ تووشی بوو، هەموی جگەرە کێشانێکە ئەم شتە پەرپوەتە مێشکی.
- شێخ گۆڕەکەی پڕ لە نور بێ، هاتبووە ئەشکەوتە کانی پشت ئاوایی، شەوێ ناردی بەدوماو بۆ راسپاردەیەك ناردمی بەو دیوا... بۆ (وەیسە)، راستت دەوێ منیش لە ڕودا امام و شەرمم کرد داوای کەسێك بکەم لەتەکما، هەربەو شەوە پایزە، نمە نمە باران دەباری کە من بەرداو بەردو دەوەن بە دەوەن بەم کەلە سەختەدا هەڵ دەزنام، لای کانی یەکەوە تێ پەڕیم و گوێم لێ بوو بانگیان دەکردم، بەناوی خۆم هاواریان لێدەکردم !!، ڕۆیشتم، هەنگاوەکانم خێراتر کردو فیشەکێکم هێنایە پێشەوە... ئاوڕم نەدەدایەوە؛ بڕۆن بەلەعنەت بن، چیتان لێم دەوێ، نەوەستام. ئەو ڕێگا دورو سەختەم لەخۆیەوە لێ تەواو بوو، کاتێکم زانی گوێم لە سەگوەڕی ئاوایی یەکە بوو و چراکانی ماڵەکانیش کز کز پەرش و بڵاو وەك خاوەنەکانیان وەنەوزیان دەدا.
ئا، هەر ئەم خەیاڵە بوو، بەم ڕۆژی روناکە ئەمەی هێناوەتە مێشکی و لە ناسەی خۆی گومان دەکات.

هەستاو ڕێگاکەی گرتەوە بەر، سمۆرەیەك بەدارێکدا سەرکەوت و قوڕی یەك لە درزی بەردێکەوە سەرەتاتکێی بوو: (کێ ئەڵێ ڕۆحیانەتەکەیان نەچوتە ئەم شتانەوەو ئاوا خۆیانم پیشان نادەن... بۆ ؟ نابێ ؟!)
- بە پێی تیوری تەناسوخ، ئەم گیانەی ئادەمی هەردەمێنێ، ئەگەر پیاوچاك بوو ئەوا لە شێوەی گیان لەبەرو ئادەمی چاکدا دەنوێنێ و پێچەوانەکەشی ڕاستە.
- سەرهەڵدانی ئەم باوەڕە چ لایەك بوو ؟
- ڕۆژ هەڵات، هیند تا میسۆپۆتامیا.
کچەکەی بەردەمی عاشق بوو، لەباتی گوێ گرتن لە بابەتەکە بەقەڵەمەکەی وێنەی دڵێکی گەورەی کێشاو ئیتر ناوەوەی بە دڵی وردتر پڕ کردەوە.
لای بۆ کردەوەو:
- گوێ گرە، ناترسی بمری.
- ئێمە نامرین، عاشق هەر زیندووە.
وشەکەی دوایی ئەو کچە تینێکی دایە، هەرچەند ساڵێك بەسەر ئەم قسەیەدا تێ پەڕیبوو بەلام زوو زوودەهاتەوە بیری، لەگەڵیشیا خەم و ترسی دەڕەوانەوە.

هـەنجیرە کێـویلەیەك بـەلاپاڵی روخـاوی رێگاکـەوە وەك بـەزۆر خـۆی هێشتبێتەوە ئاوا لقەکانی شۆڕ ببوونەوە، لە نێوان گەڵاکانیدا بەرەکـەی رەش دەچۆوە، لایداو دەستیکرد بە هەنجیر خواردن، لەوەدا بـوو دەست هەڵگـریٚ هەستیکرد کەسێك ئەمەندە لیٚی نزیکە گویٚی لە هەناسەکەیەتی، دەستی لە کەمەندی تونو کردو گورج ئاوڕی دایەوە، لقی هەنجیرەکە کەوتە ژێر چەناگەیو گەلا زبرەکە بەرچاوی گرت، وازی هێناو ڕوٚی، بەلاٚم تاماوەیەکیش هەر تەپەی دڵی دەهات.

ویستی ئەو خوٚفە لەبیـر خوٚی بەرێتەوە، جەمسەری بیـر کردنەوەی گرتو ترازاندیە روکارێکی تر؛ (خوٚشەویستی رواڵەتێکی تری ئەو بەربەرەکانیەیە کە گیان لەبەر بەرامبەر مردن دەینوێنیٚ، هەنگاوێکە بوٚ جوت بوون، لە ئـەنجامی ئەمەی دواییشدا بووەیەکی نویٚ دێتە کایەوە... ئەمەیان لوتکـەی زاڵ بوونـە بەسەر مردندا... مردن دەیەویٚ بوون نەهێڵیٚو بوونیش بە گیانداریٚکی نویٚ مل ملانیٚی لەگەڵ دەکات).

خوٚشی نەی دەزانی بوٚ لە هەمو بابەتەکانی خوێندن تەنیا فەلسەفەی بەلاوە بـەتـامو سـەرنجـاوی بـوو، چـونکـە لە گـەردونو بـوونو ژیـانو دیـوی نادیاردەکوڵێتەوە ؟ چونکە زوٚر روٚدەچووە خوارەوەو پەنهانیـەکانی ئەم گیانە بزێوەی دەردەخست ؟ یان بەدوای شتێکی نا دیاردا وێڵ بوو ؟ وەیان چونکـە (سازگار) حەزی لیٚ دەکرد ؟

تەنیا یەکێك لەمانە نا، هەموی بە کوٚمەڵ، هەر ئەم فەلسەفەیەش بوو، بووە پردی بەیەك گەیاندنی ئەمو ئەو، چونکە لەهوٚڵی دەرسەکەدا چالاك بوو، ئەویش حەزی دەکرد لە پەنایەکدا تەریك بنو تەنیا بوٚ ئەمی باس کات.

کە چاوی ورد بوونەوەی لەدەریای روانینی ئەودا تەی دەکرد، هەرچی پانایی‌و بەرینی ئەم دنیاو گەردونو پاشکوٚکانیەتی دەبوونە کونی دەرزییەك، دەبوونە خاڵێکی وردی یەکێك لەو وشە زوٚرانەی سەر لاپەڕەی (مەلزەمەکە).

- ئاگادار بە، خەیاڵت نەڕوا.
- بە من دەڵیٚی، توٚ خوٚت !

بزەو گەشیی سەرو سیما ئاوێتە بـوو، مەلزەمـەکەی داخستو ویستی شتێك بڵیٚ، بەلاٚم ئەو گورج لە دەمیسەندەوە:

- فەیلەسوف بی خوٚشە، بەلاٚم پەراگـەندەییو تـەریکیو گوٚشـەگیری من لە گەڵیدا نیم.

- سازگار، بەئەستوری هەمو کتێبەکـانی ناو ئـەم کتێبخانـەیە، من لەمـەدا لەگەڵتام.

- منیش بە بەرزایی هەمو بیناکانی ئەم ناوە.
- کاممان دەیبەینەوە.
تریقانەوەیەکی بێگەردو چەپڵەماخەی حەزێکی شێت لەپڕ هێنانیەوە سەر خۆیان.
لەپی دەستی نوسان بە پشتی دەستیەوە، سەری پەنجەکانی یاری بەجوتە بازنە ئاڵتونەکەی دەستی دەکرد، ئەو چاوی لەهاتنی دوو قوتابی بوو، دەستی دەرهێناو:
- با بڕۆین، پێت کرا عەسر دێم.
عەسریش لەو جێیەی دەستی لەسەر دانا وردە وردە پیاهات، ئەم لە دنیای (ئەبیقۆرو کەلبی یەکان و بوزاو لائوسی)یەوە هەتا (مانی)و دوای ئەوانیش دا گەشتی دەکرد، تاسەی شەپۆلی یەك لە دوای یەك نێوانێك بوو بۆ هەر بیرەوەریەك، قژی رەشی خاوی کەمێ زبری تێکەڵ بە روی ئەویش ببووە، ئارەقەیەکی لینج و خەستیش وەك کەتیرە ئەو دوو لەشەی لەو ئاستانەدا لەیەك دەدا کە لێکیان دابوو، فێنکی و گەشکەیەکیش دوای لێك بەربوون وەك شەپۆلی ئاوازی ریکۆردەکەی لایانەوە بەسەریا دەهات.
زۆر جار جڵەو بەردەبووو دەکەوتنە لێژی، بەربەرەکانی مردنەکە لەوەدابوو روبداو (سازگار) وریاترو زرنگتر بوو، وەك سورە ماسی یەکی سرك و خز خۆی دەفرتاندە لاوە:
- چی یەکەی ؟ لەسەر خۆ !!

لادەکەوت بەڵام ئەو دوو گیانە هەر تێك ئاڵا بوون، لەشەکان جیا بوون، هەریەك لەسەر گازی پشت هەنسکە بڕکێی بوو، بە دەست ئارەقەی لە نێوچەوانی، لاجانگی، لاملی دەسڕی یەوە، بەڵام زۆری نەدەبرد، ئەوەندە لاسار بوون، هەرچی (ناشێ، نەکەی، چۆن، نەخەڵەتابی) ئەو چەند ساڵەیە فەرامۆشیان دەکردو دەکەوتنەوە نەرمە غارێکی خۆش، بەگوتی دەریای فەلسەفەی ژیان و مان و نەماندا، بەسواری ئەسپێکی رەشی قەترانی ناوچەوان سپی یەوە بەبێ ئەوەی یەك پارچە پەڕۆیان پێوەبێ، پاژنەی پێ یان لەبەر ورگی توند دەکردو ئەسپەش دەیحیلان و دەکەوتە چوار ناڵە، جڵەویان رادەکێشایەوە... دەکەوتەوە نەرمە غار... دیسان چوار ناڵە... نەرمە غار... چوار ناڵە... نەرمە...
ئەمە لە خۆیدا رواڵەتێکی سەردەمەکەی بوو. لەپێچی تولە رێگاکەدا، لەبن بەردێکدا لاشەی رێویەکی تۆپیو کەوتبوو، لێی ورد بۆوە، نیوەی رزیبوو، (ئاخۆ چ ئازارێ، فیشەکی کام راوچی، ساچمەی کام رێبوار، پێوەی داوەو بەو برینارییە خۆی خزانۆتە ئەم بن بەردە... ئای ژیان، مانەوەو رزگار بوونی خۆی لەم ژێر

بەردەدا دیوە... بەڵام)... ملی ڕێگاکەی گرتەوە، قورساییەکەی شانی چەپی دابەشانی ڕاستیا، دەستێکی کرد بە گیرفانی شەر
واڵەکەیداو دڵنیابوو لەوەی کە نامەکەی تێدایە.
- دنیای ئەمڕۆ هەروەك جارانە... گەلحۆکان وەك خۆیانن... تاوانێکی گەورەو لێفەیەکی شڕ.
- شتەکان زۆر ورد دەکەیتەوە...
- ئەمڕۆوا پێویست دەکات.
لە ملەکەوە داگەڕایەوە بۆ باسکەکەی ئەوبەر، لەبن دەوەنێکدا جوتێ کەوفجوقیان کرد بەرەو ئەو
بەر بوونەوە، کپیو بێدەنگی، سێبەرێکی کەڕ، شنەیەکی فێنك، بۆنی کوێستانێکی خۆشی دەدا بەڕودا... تاتوانی هەناسەیەکی هەلمژیو سنگی کردەوە، هەردوو باسکی بەرەلاکرد، وەك ئەو سروشتە بەرزە بگرێتە باوەشی یا بچێتە باوەشی.
شاخەکە فراوان بوو، بەرزتر بوو هەتا بووە کێوێکی مەزنو ئەوو وەك خاڵێکی بریسکەدار بەدامێنییەوە سەردەکەوت.
لەپێ دەشتەکەشدا، هەمو شتەکان بەڕونیو بێپەنهانی، وەك لە ژێر زەڕەبینێکدا بن ئاشکراو دیار بوون، تێی دەڕوانینو لێکی دەدانەوەو دەشی زانی سەرەنجامەکەی چیدەبێ... ئەمە بەلایەوە ئەوەندە ئاسان بوو، لە وەلامی ئەو پرسیارەی کە سەری ساڵ بەلای سازگارەوە بێستونێك بوو: (دوو ئەلەکترۆن لە ئۆربینالێکدا هاو بارگەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە بارگەکانیان نێگەتیڤە ئەتوانن بژین... بۆچی ؟ چۆن ؟!).
قاقا پێکەنی، هەمو ماسولکەکانی جمان، دڵو دەرونی بەئەندازەی دەشتە بەرینەکەی شارەزوری خواریەوە مزاوان بوو... دیسانەوە سەری داوەکانی کەوتنەوە دەستو گرێ کوێرەکانی دەکردەوە، ئەوداوە بەو نامۆنەبوو، جارێکی تر لەوە بەر، باوکی، داوێکی تری ئاوای کرد بۆوەو ئەمیشی فێر کردبوو.
دەستێکی دایەوە لەلا ڕانی، بۆ گیرفانی شەرواڵەکەیو دڵنیا بۆوە... ئیتر هەنگاوی نا بەلام بە ئاگاییەکی بێ ئەندازەوە، دەیڕوانییە هەر بنچکێ، ژێر دەوەنێ، لاپاڵێ، بن بەردێ هەتا لای دەکردەوە بۆ ویزەی هەنگێکیرش.

چیرۆك

# شەڤۆ

نڤیسینا: نور الدین أنور بۆتانی

دنیا هاڤینەکا درەنگی‌یە،.. ها.. تو نەمایە، پشتی چەند ڕۆژێن دن ئەمێ داکەڤن پاهیزێ. لێ پا هێش دنیا کەلە کەلە وتینا گەرمێ ناهێلە خوهدان ژئەنیا مرۆڤی زوهابە، تنێ بەشەڤ قاسەك هونك دبە، لەورا ژی هەرشەڤ بایەکی هێن ژچی‌یێ بەر بگوند دهات،.. گوندێ مە ژی لەدە شتێیە وقاسێ سەعەتەك ڕێ ژچی‌یێ دوورە.

هەلبەت ئەم ژی مینا هەمی خەلکێ گوند، مە (دەهـ ـ دوزدە) سەرێن پەز هەبوو، شڤان ژی لگوندێ مە تو نە بوو، تنێ مالا ئاغێ شڤان هـەبوو، لەورا گوندی هەرکەس بخوە چاڤ دێری لەپەزوسەوالێن خوە دکر، (شەڤو) ژی کورێ من نێ مەزن هەرۆ پەزێ دبر ئاقار ودچێراند.

ئەز ژی سالێ (دوو ـ سێ) پەرچە ژڤادێ ڕادکم وتوڤێ خـوە لێ دەچینم، لەورا ژی (دوو ـ سێ) پەرچێن ڤادێ بزۆر ئابوریا مال وزارۆکێن من پێ دهات، هەر چاوا بە مە دەباریا خوە پێ دکر.

ئێڤارەکێ ژبەری ڕۆ ئاڤابە، (ڕەوشێ) خەباتا شیڤێ دکر، (شەڤۆ) ژی هێش ... نەهات بوو. ئەز ژی دئۆرتا حەوشێدا دگەل زارۆکێن خوە ڕونشتی بووم ئو ... دبا.

(تەمۆ) کورێ من ئێ بچوك گۆ: باڤۆ ئەز برچی مە ؟.. من ژی دەنگ ل (ڕەوشێ) کر.

ڕەوشێ.... ڕەوشێ.... دە زوو بە لێ، ئەڤ چ بەتە هات، کا شیڤا مە ؟..

(ڕەوشێ) بەرسڤا من دا وگۆ: ها.... ئها.. تو نەمایە چاڤێ من ئەزێ ژوەڕا بینم، ما قەی وون برچی بوونە ؟.. کا ڕابە (کۆچەرا) من ئامانان وەرێن، دەنگ لکەچا من ئا مەزن کر وگۆ:

ئەرێ «جامێرۆ».. وەلا گرارا مە ژی کێم بوویە ئو تو زانی کو ئیسال مە چ گەنمێ پاقژ نینە بۆ خوە ڕاکن، نێ من سەد جارا دگۆ: ڤی گەنمێ قەندهاری لزەڤیا پێش گوند مە چینە، قادا وێ گەلەك بدەخەلە.

دی بلا ڕەوشێ، تشتەك نابە، بلا ئیسال ژی بخێر هەڕی، سالەکا دی ئیشەللا ئەزێ زوو دەست هلدم شوڤا خوە باژۆم ئو ژ (دەهـ) تغارێن گەنمی کێم تر ناچینم، مانێ (ڕەزۆ) یێ پسمامێ من ژکەرەما خوە وێ هێسترەکا خوە ژمنڕا بشینە، ئەز جوتێ خوە پێ بکم.

ئەرێ... ئەرێ.. (ڕەوشێ) تنازێن خوە بمن کر وگۆت:مانێ تە سالا پار ژی دگۆ ئەزێ (دەهـ) تغارێن گەنمی بچینم، ما قەی تو ژی بوویە (میرزۆ) یێ سۆڤی (حەسۆ) ؟... (دەهـ ـ دوزدە) تغارێن گەنمی بچینی هێشتا هەر پاهیز !...

تەق.. تەقا... دەری هات وخولامێ ئاغێ بزۆر کەت.

سلاڤ دا ومن سلاڤا وی ڕاگرت.

من گۆ: کەرەمکە برا ڕوونە ؟.

گۆ: خوەدێ ژکەرەما تە کێم نەکی برا، لێ ئەز بلەزم ودڤێ هەڕم ناڤا گوند ئو ژگوندیاڕا بێژم کو ئاغای دڤێ وون تەڤ ئیشەڤ وەرن دیوەخانێ.

مگۆ: سەر چاڤا برا، ئەز ژی شیڤا خوە بخوم وئەزێ وەرم.

دەستورا خوە ژمن خواست وچو.

ڕەشێ گۆ: (چەکۆ).. ئەو کی بوو وەها بلەز چۆ ؟.

مگۆ: (سمۆیێ) خولامێ ئاغێ بوو.

گۆ: دیسا (سمۆ)....!. نێ مە پێر دیکلەك دابوویێ ژئاغێڕابربوو، ئیرۆ بونا چ هاتە ؟

مگۆ: بونا دیکلێ نەهات بوو، لێ ئاغای دڤێ کو ئەم تەڤ ئیشەڤ هەڕن دیوەخانێ ووێ چەند پرس وگۆتنا ژمەر بێژی.

گۆ: پرس وگۆتنا چاوان ؟

مگۆ: ما ئەز ژکو دزانم..

ڕەوشێ گۆ... هێ.... (چەكۆ).. ب سەرێ كەكێ خوە كم، هەبە تو نەبە،
گوندا وسەر كانی‌یی‌یە !....
دگۆ گۆتنا چی كەچێ ؟
گۆ پا سوبێ چاخێ ئەز چۆ بووم سەر كانی‌یێ، من بهیزت بوو پیرا
(سیڤێ) دگۆتە (خەجۆكا) ژنا سۆرۆ كو دوهی یەكی پەزێ خوە بەردایە
بوستانێ ئاغێ ئەوێ دبەر گوندرە.

ئەز كەتم گۆمانا ودلێ من ژی پڕ دترسا چاخێ من ئەڤ بهیزت.
ئاخر... من شیڤا خوە خوار وبلەز ڕابووم ئو من لنگێن خوە لبایێ بەزێ
خست وپێرا دەركەتم بۆ دیوەخانێ، ئەز گهام دیوانێ، من سلاڤ دا جماعەتێ
ووانا سلاڤا من ڕاگرت و بخێرهاتنا من كر، گوندی تەڤ لور بوون، تنێ ئاغا
ومەلایێ گوند نەهات بوون، قاسێ نیڤ سەعەتێ ئەم مان، من هەو دی ئاغا
ومەلایێ گوند ژی بزۆر كەتن، ئەم تەڤ ژبەر وان ڤە ڕابوون ئو مە سەرێ خوە
ژوان‌ڕا چەماند.
ئاغا ڕونشت سەرێ دیوانێ وگۆ:

گەلی جماعەتێ... دوهی یەكی پەزێ خوە بەردایە بوستانێ مەیێ دبەر
گونددە، ڤێجە ئەز ومەلێ مە تۆلا ڤێ یەكی دانی‌یە كو ژ (پێنج)سەرێن پەز و
(دەهـ) تغارێن گەنمی كێم تر نەبە، لەورا ئێ پەزێ خوە بەردایە بوستانێ مە،
دڤێ سوبە ب خوە تۆلا مە بینە، ژبەری ئەزوە تەڤان سوند بدم وبزانمە ئەوكی‌یە.
جماعەتێ...
یەكی گۆ: وەلا ب سەرێ شێخ كم نە پەزێ منە.
یەكی گۆ: ئەز بەنی، پا دگۆتن دوهی شڤانێ وە لور بوو.
یەكی گۆ: وەلا من دوهی (سێ ـ چار) چێلەكێن سۆڤی (حەمۆ) لور دی بوو.
یەكی گۆ: پا لاوێ مە دگۆ: دوهی (شەڤۆ) ژی لور بوو.
هەر یەكی گۆتنەك كر.
دەبەسەلۆۆۆۆ.. بەسە. هەما مە ئا خوە گۆت ڤێجە كی پێ نە خوەش ژی
بە، بلا ژڤر باركی وكودا هەری بلا هەری.
ئەم قاسەك مان وپاشێ یەكو ـ یەك ڕابوون بەر بەمالا خوە زڤرین.
ئەز گهام مال (ڕەوشێ) هات پێشی‌یا من و گۆ:
خێر بە چەكۆ، ئەڤ چما تو ولو ب خەمی، ما تشتەك هەیە ؟
مگۆ: ڕەوشێ خوەدێ ئالیكارێ مە بە، كاشەڤۆ ژئاقار هاتە ؟.

گۆ: بەلێ وێ لسەر بان ڕازایە.
من دەنگ ل (شەڤۆ) کر، کا وەرە لاوێ من.
(شەڤۆ) هات ودلێ من ژی هێش پڕ دترسا.
من گۆ: کی دوهی پەزێ خوە بەردایە بوستانێ ئاغێ لاوۆوو ؟.
گۆ: وەلا باڤۆ دوهی ئەز گەلەك وەستیایی بووم، ئو لاشێ من ژی پڕ دێشا قاسێ (پازدە ـ بیست) دەقیقەکا ئەز ڕازا بووم، ئەز شیار بووم من هەو دی پەزێ من لور نەمایە !.. من هۆ نێری... هۆ نێـری لێ من تشتەك لوان درا نـەدی، جارکێ من هەو لێ نێری من کەریەك پەز دنێڤ بوستانێ ئاغێ دی.........
ئەز هێرس بووم ومن شەقامەك لبنێ گوهێ (شەڤۆ) خست، من کر ئەز شەقامەك دن ژی لێ. بخم، لێ ڕەوشێ نەهێلا.
گۆ: دە بەسەلوۆۆ.. هێرس مەبە، ما قەی تو دێ کرڕك ژی بکوژی ؟.
بڕاستی ژی ئەز گەلەك هێرس ببووم، پاشێ من هزر کر ئەز ڤەگەرم مالا ئاغێ وهیڤیا ژێ بکم بارێ مە پیچەك سڤك بکی ژبەر کو ئەم خزانن ونکارن ئەو تۆلا ئاغا دخوازی بجی بینن، ئەز لبەر بووم بچم من دی (شەڤۆ) بدەنگەکێ نزم گۆ: باڤۆ نێ ئەو کەریێ پەزی نەیێ مە بوو.
م گۆ: پا پەزێ کێ بوو لۆ ؟
گۆ: پەزێ مالا ئاغێ بوو، نێ شڤانێ وان ژی لچۆلێ ڕازا بوو ئو پەزێ مە ژی ژبەری بگهێژە بوستانێ ئەز پێڕا گهام ئو من زڤڕاند.
ئەز گەلەك پوشمان بووم چاخێ من ئەڤ بهیزت.
م گۆ: لاوێ من لمن مەگرە، من نەزانی بوو ئو من ئەو شەقام لتە خست.
شەڤۆ بکەنی بەرسڤا من دا وگۆ: خەم ناکی باڤۆ، تشت تو نە بوویە، ما قەی ئەڤ جارا یەکێیە تو شەقاما لمن دخی ؟..
ئەز مام وێ شەڤێ دگەل خەما وێ شەقاما من ل (شەڤـۆ) خست بوو، چەندی من دکر ئەز ڕازم لێ خەوا من نە دهات جارنا ژی لبەر تاڤا هەیڤێ من بەرێ خوە ددا شەڤۆ ئو من لێ دنێری کو ڕازایە....

# هونەری «شانۆیی»

# مالین ماککوکین

**وەرگێڕانی:ـ ئازاد بەرزنجی**

گەر بمانەوێ هەر کارێکی ئەدەبی بە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنەوە بخوێنینەوە، ئەوا دەبێ لە پێشدا بزانین نوسەرەکە دەیەوێ بڵێچی ؟ چونکە زانینی ئەوە یارمەتیمان ئەدات ئەو ئامانجە بدۆزینەوە کە نوسەرەکە مەبەستێتی.

شانۆیی ئەو تێکستە ئەدەبی یەیە بۆیە دەنوسرێ تا لە سەر تەختەی شانۆ نمایش بکرێ و وەکو هەر هونەرێکی دی ڕێساو بنەمای تایبەتی خۆی هەیە، بەلام نوسەری شانۆیی پا بەستە نیە بەو ڕێسایانەی کە مێژوو نوسێك یا بایـۆگرافی نوسێك پێویستە پەیڕەویان بکات. ئێمە داوا لە دراما نوس ناکەین دەقاودەق خۆی بە حەقیقەتە مێژووییەکانەوە بەند بکا وەك چۆن ڕوویان داوەو داوای ئەوەشی لێ ناکەین خۆی بە بیرو هزرو ڕەفتاری شەخسیەتێکی مێژووییەوە ببەستێتـەوە، بەڵکو سەر بەستی یەکی تەواوی هەیە بە پێی داوا کاریەکانی هـونەرەکـەی دەسکاری لە بابەتەکەدا بکات، چونکە وەکو وتمان مێژوو نوس نیە تا وێنەیەکی دەقاودەقی ژیانی ئەو چاخەمان بۆ بخاتە ڕوو.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستەش شانۆیی ی «یۆلیۆس قەیسەر»ی دراما نوسی مەزن ولیام شەکسبیر بە نموونە دەهێنینەوە، بۆ نوسینی ئەم شانۆیی یـە نوسەر پەنای بردۆتە بەر مێژوو نوسی ڕۆمانی «پلۆتارك» بەلام بەوەوە نەوەستاوەو زۆر گۆڕانکاری تێدا کردووە، دەبینین کە دیمەنی دووەم لە پارتی یـەکەم لای پلۆتارك پێش دیمەنی یەکەم ڕوودەدا، ئەمە تاقە ڕووداویش نی یە کە شەکسپیر بە

شتێك سەربەستی‌یەوە دەسکاری کرد بێ، تەنانەت وتارەکەی پروتوس دوای کوشتنی قەیسەر بە ڕۆژێك دەخوێنرێتەوەو لە ماوەی بیست ڕۆژیشدا دوو جەنگ لە نێو ریزەکانی سوپادا لە فیلیپی ڕوو دەدات. هەر وەها شەکسپیر لە هەندێ وردو درشتی ژیانی ڕۆمانیدا بە هەڵەدا چووەو هەندێ خوو و تۆرەی لە مێژووی ئەلیزا بینێ‌یەوە وەرگرتووەو بەسەر ڕۆمانی‌یەکانیدای سەپاندوە وەکو بەرز کردنەوەی کڵاوەکان لە لایەن ڕۆمانی‌یەکانەوەو هەروەها یولیوس قەیسەر لە بری ئەوەی بەرگی ڕۆمانی بپۆشێ سەدریەی کردۆتە بەرو پیلانگێرەکان تا سەر گوێیان کڵاوەکانیان هێناوەتەوەو کاسیوس بە کاتژمێر باسی کات دەکات و ئەمە بێجگە لەوەی کە ناوی بازاڕ لە مەیدانی ڕۆمانی دەنێ و سەکۆی وتار بێژی بە مینبەر ناو دەبات و لاشەی قەیسەر کفن ئەکرێ و پروتوس پەرەیەکی کتێبەکەی هەڵدەداتەوەو ئینجا دەیەوێ لەگەڵ شەیتان بدوێ، لە کاتێکدا کە ڕۆمانی‌یەکان نەزانیویانە کڵاو چی‌یەو نە سەدریەو نە کاتژمێرو نە مینبەرو نە کتێبیش.

بەلام ئەم هەڵانە زادەی مەزنایەتی ئەو دراما نوسەبووەو بەڵگەن بۆ لێهاتوویی لە کاری شانۆییداو شتێك نین بەرچەپ و هاو دژ بن لەگەڵ هونەری شانۆییدا، هەر وەها هونەری ناوبراو لە سەر ململانێ‌یەکی ناوەوەیی ڕۆدەنرێ و پێویست بە بوونی کاراکتەرێکی سەرەکی دەکات کە ناحەزی هەبێ، لە شانۆیی ی یولیوس قەیسەردا گەر پروتوسمان بە کاراکتەری سەرەکی دانا کە دەیەوێ پارێزگاری کۆماریەتی ڕۆما بکا ئەوا دەبینین کە قەیسەر هاو دژەکەیەتی و دەیەوێ تاجی شایەتی لە سەر بنرێ، نوسەری شانۆییش نایەت وەکو مێژوو نوسێك هەموو هۆیەکانمان پێ بلێ و ڕای خۆی تێ هەڵکێش بکا، بەڵکو ئەو لە خیلالی ڕووداوە شانۆییەکانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە بەلام دەبێ نوسەر ڕۆڵی ڕاستەقینەی خواست و ئارەزووەکان و ئیرادەی مرۆڤ لە خیلالی ڕووداوەکانەوە بخاتە ڕوو.

ئێمە نامانەوێ بە دیتنی شانۆیی ی «یولیوس قەیسەر» مێژووی ڕۆما فێربین بەڵکو دەمانەوێ ململانێ‌ی نێوان دوو کاراکتەر کە قەیسەرو پرۆتسن لە خیلالی ئەو ڕووداوانەوەی کە لە سەر تەختەی شانۆ ڕوو دەدەن ببینین.

بەلام نوسەری شانۆیی پا بەستەی هەندێ کۆتەو پێویستە لە سەری پێوەی بەند بێ، «فۆرم» لە گرنگترین ئەو کۆتانەیەو نوسەر ئەو شتانەی کە دەیەوێ بیانلێ بە هۆی - ڕووداو - و - ئاخاوتن - ەوە گوزارشتیان لێ دەکا، ئەو ناتوانێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەر وەکو چیرۆکنوس پێمان ڕابگەیەنێت کە فلانە کاراکتەر وا بیر دەکاتەو وا ڕەفتار دەکاو وا دەڕوانێتە ژیان، بەڵکو دەتوانێ وامان لێ بکات لە کاراکتەرەکە بگەین کاتێك پەیڕەوی ئەمانەی کرد:-

١ ـ کاراکتەرەکە لە بارەی خۆیەوە بدوێ.
٢ ـ کاراکتەرێکی دی لە بارەیەوە بدوێ.
٣ ـ کاراکتەرەکە بێتە سەر شانۆو بەشداری ڕووداوەکان بکاتو بواری ڕادەبڕین و ناسین بۆ تەماشا کەر دابنێ.

جۆری دووەم لەو کۆتو پێوەندانە، کۆتو پێوەندی بەدەنین، نوسەر بەستراوە بە توانای دیاریکراوی مرۆڤانەی ئەکتەرەوە بە هەڵسانی بە کارەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتوو لە سەر تەختەی شانۆ. کۆتی سێیەمیش «کات»ە، نوسەر دەبێ لە ماوەی دوو کاژێر یا سێ کاژێردا شانۆییەکەیمان پێشکەش بکات بە پێچەوانەی چیرۆکنوسەوە کە سەربەستی یەکی تەواوی هەیە لە دیاریکردنی کاتی چیرۆکەکەی یا ڕۆمانەکەیدا، هەروەها نوسەری شانۆیی پابەندە بە یەکەی ڕووداو و کاراکتەرەوەو پێویستە سروشتی کاراکتەرەکان لە گەڵ ئەو شتەدا بگونجێ کە پێی دەڵێین «سروشتی مرۆڤایەتی».
ئەمە لە لایەکەیەوە لە لایەکی دیشەوە نوسەری شانۆیی هەندێ ماف تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە بۆی هەیە تەختەی شانۆ بکاتە قەڵایەك یان گۆڕەپانی جەنگێك یان ڕووی پاپۆڕێك و بۆی هەیە بەشەش کەس سوپایەکی تەواو پێك بهێنیو دەتوانێ بەو شێوەیەی کە بە گونجاوی دەبینێ دەسکاری ڕووداوەکان بکاتو وا لێرەیشدا لە هەندێ مەسەلەی گرنگ دەدوێین کە پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆیان بە هونەری شانۆییەوە هەیە:ـ
١ ـ شیرازە «الحبکة»:ـ
شیرازە پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆی هەیە بە یەك بە دوایەکدا هاتنی ڕووداوەکانەوە، بێگومان هەر یەکێك لە ئێمە بەسەریدا تێ پەڕیوە گوێی بۆ چیرۆکێك ڕادا شتبێ یان خوێندبێتییەوەو بەڵام لێی بێزار بوو بێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لێنەهاتوویی چیرۆکنوسەکە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا بە شێوەیەکی دروست تا بگاتە ئەو خاڵەی کە کارتێکردنی داوا کراو بدات بەدەستەوە، لێرەشدا مەبەست لەو خاڵە «ترۆپك» یان «لووتکە» یە لە شانۆییدا، بۆیە دەتوانین پێناسی شیرازە بەوە بکەین کە یەك بەدوایەکدا هاتنی ڕووداوەکانو ڕێکخستنیانە بۆ هێنانە بەرهەمی «ترۆپك».
لە ڕاستیدا ڕووداوەکان لە نێوان یولیوس قەیسەرو پرۆتۆسو ئەنتۆنیدا پەرشو بڵاون، بەڵام شەکسپیر هاتو ڕێکخستنێکی پێدان بە جۆرێك کە لەگەڵ مەبەستیدا بگونجێ، وەك لە پێشدا ئیشارەتمان بۆکرد دەبینین دیمەنی دووەم کە ڕووداوەکانی پێش دیمەنی یەکەم ڕوودەدەن شەکسپیر خستوویەتییە دوای دیمەنی یەکەمەوە تا وەکو بە هۆی ئەو دیمەنەوە مادە بنەڕەتی یەکەی شانۆییەکە

بە بینەران بناسێنێ و بیکاتە بناغـەیەك بـۆ ڕووداوەکانی دوایی، بـۆیە تیـایدا جەماوەری ڕۆمانی ڕاڕاو هەڵەشەمان پیشان دەدات و بایەخمان دەوروژێنی و بە هۆی ڕووداوەکانی دوای ئەوەوە وردە وردە بۆ «ترۆپك» مان دەبات و هەندێ جار ئەم هەست سەرخستنە بە چەمکە درامی یەکە پێ ی دەگوترێ «ڕووداوی بڵندڕۆ» چونکە تا بێت سەرنج و بایەخمان بە ململانێکە لە خیلالی ڕووداوەکانەوە بڵند تر دەبێ و چاودێریمان بۆ کاراکتەری سەرەکی زیاد دەبێ، جا گەر بێتو لە «یولیوس قەیسەر» دا پرۆتوس بە کاراکتەری سەرەکی دا بنێین ئەوا «ترۆپك» کاتێك دێ کە ئەنتۆنی وتارەکەی دەخوێنێتەوەو پاشان کـەمێك دەوەستێ تـا کاریگـەری ی وتارەکەی لە سەر ڕۆمانی یەکان بزانێ، چونکە ڕووداوەکان هەر لە سەرەتـای شانۆییەکەوە تا ئەم خاڵە لە خزمەتی پرۆتـوسدان، بـەلاّم لەم ساتـە بەدواوە ڕاگۆڕین و شێواوی بیرو باوەڕی جەماوەری ڕۆمانی دەبینین و کۆتایی ی پرۆتوس و کۆماری یەکەو شانۆییەکە بەگشتی دەزانین، ئـەو ڕووداوانەی کـە لەو خاڵەوە دەست پێ دەکەن و بەردەوام دەبن پێیان دەگوترێ «ڕووداوی نزمڕۆ»، پاشانیش مردنی پرۆتۆس دێ کە بە «کارەسات» ناو دەبرێ و دوای ئەویش بە ماوەیەکی کەم «پایان» دێ.

شانۆیی ناوبراویش «تراجیدیا» یە چونکە کاراکتەری سـەرەکی تیایـدا هەرەس دەهێنێ، و لەگشت تراجیدیاکانی شەکسپیـردا کاراکتـەری سەرەکی دەکوژرێ.

٢ - یەکەی ڕووداوی شانۆیی:-

یەکەم کێشە کە ڕووبەڕووی نوسەری شانۆیی دەبێتەوە هەڵبژاردنی ئەو ڕووداوانەیە کە لە شانۆییەکەیدا بەکاریان دەهێنێ، شەکسپیر هەندێ ڕووداوی لە (پلۆتارك)ەوە وەرگرتووەو نەهاتوە هـەموو ڕووداوەکـانی وەربگرێ چـونکە ئامانجی نوسینی نمایشنامەیەك بووە نەك مێژوونامەیەك، بنچینەی شانۆییش ملمـلانێ یە، بـۆیە تـەنها ئـەو ڕووداوانەی وەرگـرتووە کـەیارمـەتی ململانێ درامی یەکە ئەدەن و سەرنجی تەماشاکەر دەوروژێنن.

ئەو مەبـەستەی نـوسەر ئـامانجێتی لە ڕووداوە درامی یـەکان یـەکەی ڕووداوی شانۆییە، گەر سەیری تیپێکی تۆپی پێ بکەین دەبینین ئەندامەکـان هەموو بۆ بردنەوەی یاری یەکە هەوڵ ئەدەن و زۆرجار دەڵێن کە فـلانە تیپ وا یاریان ئەکرد وەك ئەوەی یەك کەس بن، بەلاّم گەر بێتو یەکێکیان بۆ خۆی یاری بکات، ئەوا ئەنجامی تیپەکە باش نابێ، ئەم نموونـەیە بـەسەر ڕووداوەکـانی شـانۆییـدا تەتبیق دەبێ، هـەر ڕووداوێـك دەبێ لەگـەڵ ڕووداوەکـانی دی ی

شانۆییەکەدا بگونجێو زیاد لە پێویستو لە سنووری دیاریکراوی خۆی زیاتر بایەخی نەدرێتیو لە بابەتە سەرەکی‌یەکە دەرنەچێ تا بەشداری بکات لە ڕاکێشانی سەرنجی تەماشاکەران بۆ ململانێ سەرەکی‌یەکەو بەس. هەندێ ڕووداو هەن کە خزمەتی مەبەستێك زیاتر ئەکەن بەلام ئەبێ ململانێ سەرەکی‌یەکە یەکێکیان بێ، بۆیە وا پێویست ئەکا نوسەر ئەو ڕووداوانە هەلبژێرێت کە خزمەتی هێلە درامی‌یە سەرەکی‌یەکە ئەکەن، ئەبینین وتارەکەی (کاسیوس) لە شانۆیی‌ی «یۆلیۆس قەیسەر»دا خزمەتی ئەو مەبەستە ناکات کەنوسەر مەبەستێتی و هەر وەها تەماشاکەر گەیشتۆتە نزیکەی «ترۆپکی شانۆییەکە» و نوسەریش دەیەوێ ترۆپکەکە توندو تیژ بێ بۆیە تەنها بەوەوە وەستاوە وتارەکەی پروتوس میسالی ڕاشگاو کە لە گەل گیانی نیشتمانی ڕۆمانی‌یەکان دەدویو وتارەکەی ئەنتۆنی خۆپەرستو زمانلووس کە ئاراستەی سروشتە چەپەلەکەی ڕۆمانیەکانی دەکا بەکار دەهێنێ، بەلام وتارەکەی کاسیۆس هێندە گرنگ نیەو خزمەتی ڕووداوەکان ناکاتو بگرە ڕەنگە لە خێراییو ئیقاعی شانۆییەکە بهێنێتە خواریو ئاگای تەماشاکەران بپچڕێنێ، کە واتەیەکەی ڕووداو ئەوە دەگەیەنێ کە هەر ڕووداوێکی بچووك دەبێ لە زیاد کردنی بایەخو سەرنجدان بەململانێی سەرەکی لە شانۆییەکەدا بەشداری بکات.

٣ - فرەمەبەستی ڕووداوەکان:-

وتمان ڕووداو ڕەنگە خزمەتی دوو مەبەست یان زیاتر بکات، ئەو ڕووداوانەی کە ڕۆلێکی گرنگ لە خێرایی ململانێ سەرەکی‌یەکەدا دەگێڕن پێیان دەوترێ «ڕووداوە سەرەکی‌یەکان» بەلام ڕووداوەکانی دی «ڕووداوە لاوەکی‌یەکان» گرنگیان کەمترە بەلام زیان بە یەکەی ڕووداو ناگەیەنن بەلکو هەستی خرۆشان زیاتر دەکەن، ئێمە دەزانین کە هەندێ لە کاراکتەرەکان لە «یۆلیۆس قەیسەر» هەوالی پیلانگێڕانەکەیان بیستووە بەلام لەگەل ئەوەشدا بە خۆمان دەلێین تۆ بلێی ئارسیمیدورس لە ئاگادرا کردنەوەی قەیسەردا سەرکەوێ.

هەندێ ڕووداو حەسانەوەیەك بە تەماشاکەر ئەدەن لەو گوژی‌یەی لە ئەنجامی ڕووداوی سەرەکی‌یەوە دووچاری دێن بەلام لە هەمان کاتدا یارمەتی بلند چوونی ڕووداوەکە ئەدەن وەکو ئەو دیدارەی نێوان پرۆتوسو پورشیا لە دیمەنی پیلانەکەدا یان هەلچوونی پروتوس لەگەل لوسیوسدا، وەهەندێ دیمەنی لاوەکی یارمەتی‌ی نیشاندانی تێپەبوونی کات ئەدەن وەکو دیمەنی سێیەمی پاری سێیەم یان دیمەنی دووەمی پاری پێنجەم کە چۆنێتی بەردەوامی جەنگی نێوان دوو سوپاکە ڕوون دەکاتەوە.

٤ - پەیوەندیی شیرازە بەکاراکتەرەوە:ـ

پەیوەندیی نێوان شیرازەو کاراکتەر لە شانۆیی یولیۆس قەیسەردا ئاشکراو ڕوونە. لە تراجیدیادا ڕووداوەکان لە ئەنجامی کاری کاراکتەرەکانەوە گەشە دەکەن نەك لە ئەنجامی ڕێکەوتەوە، ئەمەشە کە لە ڕۆمانی جودا دەکاتەوە، لێرەشدا مەبەست لە ڕێکەوت ئەو ڕووداوەیە کە لە دەرەوە خۆی دەسەپێنێو یاریدەی نوسەر ئەدات.

بۆ نموونە نوسەری ڕۆمانێکی خەم ئامێز پاڵەوانەکەی بەدخواز «شریر» پیشان ئەداتو هەندێ کردەوەی بەدی ئەداتە پاڵو پاشانیش سزاکەی بە خنکاندن یان شێلانی بە ئوتۆمۆبێلێك یان شەمەندەفەرێك ئەداتو یاخود وەکو دیکنز بە سووتان سزای ئەدات و هەرحاڵ مردنی پاڵەوانەکە لە ئەنجامی کاروکردەوەی خۆیەوە نابێ، بەلام لە شانۆییەکەی شەکسپیردا بەزینی پروتوس وەکو ئەنجامێکی کارو کردەوەی خۆی دێو لە بەر ئەوەی ئینسانێکی میسالییەو هۆشمەندی ڕامیاری لانییەو وەك ئەوەی لە سەر زمانی یەکێك لەکاراکتەرەکانەوەدێ کاسیۆس تەماشای خەڵکی بەو جۆرەدەکات کە لە واقیعدا هەن بەلام پروتوس وا تێیان دەڕوانێ کە دەبێ چۆن بن، شانۆییەکەش ئەنجامێکە بۆ کالفامی ڕامیاری پروتوس، دەبینین کە ناهێلێ ئەنتۆنی بکوژرێو ڕێی پێ ئەدا لە بەردەمی جەماوەرەکەدا بە ئارەزووی خۆی بدوێو ئەمەش دەبێتە هۆی فەشەل پێهێنانی کاوو مرادەکانی پروتوس. هەر وەها نموونەیەکی دیش لەم بوارەدا هەیە ئەویش ئەوەیە کاتێ قەیسەر قایل نابێ پێشبینەکە بناسێو لێی بکۆڵێتەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی کوشتنی. ڕەنگە ڕۆمان کۆتاییەکەی بە شادی بێت بەنیسبەت پاڵەوانەکەوە دوای مردنی هاودژەکەی، بەلام لە شانۆیی یۆلیۆس سیزەردا ئەمە ڕوو نادات لەبەر ئەوەی مەسەلەکە تەنها مردنی قەیسەر نیە بەڵکو ڕزگار کردنی ڕۆمایەو دەبینین خەڵکەکە بەشانو باڵی پروتوسدا هەڵئەدەنو قایل ئەبن بیکەن بەقەیسەر، واتە کوشتنی یولیوس قەیسەر بێهودە بوو و هیچ بەرامبەری ناوەستێتەوە عەزابەکەی پروتوس نەبێ کاتێك خۆی بەسەر شیرەکەیدا ئەداتو خۆی ئەکوژێ.

٥ - ڕاستبێژی لە ئافراندنی کراکتەری شانۆییدا:ـ

لەگەڵ ئەوەدا کە نوسەری شانۆیی نەبەستراوە بە گواستنەوەی وردو درشتی حەقیقەتە مێژووییەکانەوە بەلام دەبێ ئەو کاراکتەرەی پێشکەشمان دەکات سروشتی لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتیدا بگونجێ، هەندێ جار ئەمە

بەهەڵە لێك دەدرێتەوەو وا دەزانرێ کە دەبێ لە ژیانی ڕۆژانەشدا کەسێك هەبێ نوسخەی دووەمی ئەو کاراکتەرە بێ لەناو خۆماندا بێ، بەڵام مەرج نیەو رەنگە هەوالێ ڕۆژنامەیەك ببێتە بەڵگەیەك بۆمان کە ئەو کاراکتەرە لە ژیانی واقیعیشدا هەیەو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە نوسەر ڕاستبێژ دەبێ لە ئافراندنی کاراکتەرەکەیدا کاتێك سروشتی لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتیدا دەگونجێ.

وەك نموونەیش لە سەر ئەوە با بپرسین:- ئایا قەیسەری ڕاستەقینە دەتوانێ وەکو ڕەفتاری قەیسەری شانۆییەکە ڕەفتار بنوێنێ ؟

یان ئایا جەماوەری ڕەمەکی وەکو جەماوەری شانۆییەکە هەڵوێست دەنوێنێ کاتێ سزای سینای شاعیریان دا هەر لە بەر ئەوەی ناوی لە ناوی یەکێك لە پیلانگێرەکان دەچێ ؟ گەر وەڵامەکە بەڵێ بوو ئەوا وێنەکە وێنەیەکی ڕاستگۆیەو تەباو گونجاوە لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیدا.

هەروەها سیفەتێکی دی هەیە پێویستە کاراکتەری شانۆیی خاوەنی بێ ئەویش تاکێتی‌یە، ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێ کە کاراکتەرەکان هەندێ نموونەی دەقاو دەقی نێو ژیان بن، بەڵکو لە خۆمان بپرسین:- ئایا کاراکتەری شانۆییەکە لە کاراکتەرێك دەچێ کە بیناسین یان لە بارەیەوە خوێندبێتمانەوە ؟ بێگومان پروتوس لە زۆر کاراکتەر دەچێ بەڵام هەر خاوەن تاکێتی‌ی خۆیەتی‌و بەوە دەناسرێ کە میسالی‌یەك بوو لەو بڕوایەدا بوو تاقە دەستێك دەتوانێ کۆیلایەتی لە ناو بەرێ‌و لە نیگار کێشانی ئەو کاراکتە - رەدا شەکسپیر سەرکەوتنێکی مەزنی وەدەست هێناوەو تەنانەت لە کاراکتەرە لاوەکی‌یەکانی نێو شانۆییەکەیشدا وەکو مادولوس‌و فلافیوس‌و کاراکتەرە ڕۆمانیەکانی دی.

# بەراووردێکی وێژەیی
# لە ناوەند چیرۆکی
# (مەم و زین)و چیرۆکی (ئیلیادە)دا

نووسینی: شاکر فتاح

## ئەم نووسراوە

لە ساڵی ١٩٦٩دا نووسراوێکی خۆمم بڵاوکردەوە، ناوم نابوو (چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا). لە ساڵی ١٩٨٣دا نووسراوێکی ترم بڵاوکردەوە، لەژێر ناوی (ئەلیادە)و (ئۆدیسە)دا کە بە هی (هۆمیرۆس) دانراوەو، لە عەرەبی یەوە کردبومە کوردی. لە ساڵی ١٩٨٥یشدا لەلایەن (زانکۆی سەلاحەددین)ەوە داوام لێ کرا کە لە کۆڕی (بەراووردکردنی وێژەیی)دا، هاوبەشی ی (وەرزی ڕۆشنبیری)ی زانستگای وێژەیان بکەم. منیش بە هەلمزانی، لەژێر ناوی [مقارنة أدبية بين قصتي (مموزين)و (إلياده)]دا نووسراوێکی خۆمم بە زمانی عەرەبی پێشکەش کردن، کەلەو کۆڕەدا بیخوێنمەوە. ئەوانیش نووسراوەکەمیان چاپ کردو بەسەر گوێگرانی کۆڕەکەدا دابەشیان کرد. جا بۆ ئەمەی (خوێندەوارانی بەڕێزی کورد) لەو نووسراوەم بێ بەش نەمێننەوە، گۆڕیمە سەر زمانی کوردی و پێشکەشم کردن، هیوادارم کەڵك و خۆشی ی لێ ببینن.

هەرچی نووسراوی [ئیلیادە]یە، چیرۆکێکی ئەمەندە ناوازەو نایابە، شاهکارێکی (هۆمیرۆس)ی یۆنانی دادەنرێ، کە ئەمە (٣٠٠٠) ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە. کەچی هێشتا لەناو وێژەی جیهانیدا نرخ و گرنگی ی خۆی ون نەکردووە.

هەرچی چیرۆکی (مەم‌وزین)ی خانی یە، تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٩٤ی زایینی. بەلام ئەمە نزیکەی سەدەونیوێکە ڕۆژهەڵاتناسان و ویژەوانانی جیهان بایەخی پێدەدەن و بە زمانە زیندووەکان پەرچڤەی دەکەن و بڵاوی دەکەن و ویژەدۆستان ئەمیش بە شاهکارێکی ناوازەو نایاب دادەنێن.

● (ئی. ئا. ئوربلی) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسە دەڵێ: «ئەحمەدی خانی، لەڕیزەی (روستاولی)ی گورجستان و (فیردەوسی)ی ئێراندایە. ئەم بویژانە هەرسێکیان دۆست و دڵسۆزی نەتەوەی خۆیان بوون». دیسانەوە دەڵێ: «ئەحمەدی خانی لەناو هەموو کوردستاندا ناوبانگی بڵاوبۆتەوە تێکرا هەموو کوردێکیش ئەحمەدی خانی بە بوێژو ویژەوان و دۆستی نەتەوەی کورد دادەنێ».

● (قانات کوردۆ) کەمامۆستایەکی ویژەی کوردی‌یە لە زانکۆی لینینگراددا لە پێشەکی‌ی نووسراوی (مەم‌وزین)دا کە لەلایەن (م، ب. ڕۆدنیکۆ) و چاپکراوە بە زمانی ڕووسی دەڵێ: «لە ساڵی ١٩٣٣دا لە (یەریڤان)دا کۆنگرەیەکی (کوردناسان) گیراو بڕیاریان‌دا کە چیرۆکی (مەم‌وزین)ی ئەحمەدی خانی بە تیپی لاتینی بۆ (کوردەکانی سۆڤییت)لە چاپ بدەن».

● (دوکتۆر بلەچ شیرکۆهـ)، لە نووسراوە بەنرخەکەیدا: (القضية الكردية) لە ساڵی ١٩٣٠دا، دەڵێ:

«ئەحمەدی خانی، زانایەکی گەورەو بوێژێکی دڵدار بووە. بێجگە لە هۆنینەوەی هۆنراوە، هۆگری‌یەکی تەواویشی بە هونەرە جوانەکانەوە بووە. چیرۆکی (مەم‌و زین) یش کە زۆر بەناوبانگەو بێ‌وێنەیە لە بابەتی خۆیدا، مەگەر (ئیلیادە)ی (هۆمیرۆس)ی بگاتێ، هی ئەوە».

● منیش، هەروەك لەم لێکۆڵینەوەدا، کە پێشکەشی خوێندەوارانی بەڕێزی کوردی دەکەم، بۆم دەرکەوتووە: چیرۆکی (مەم‌و زین)ی (ئەحمەدی خانی)، لە چیرۆکی (ئیلیادە)ی (هۆمیرۆسی) یۆنانی، گەلێك بڵندترە، بەکەلك ترە بۆ خوێندەواران، چونکە فێری خوداناسی و ڕەووشت و خووی شیرین و، کردەوەو کاری بەرزو پیرۆزو؛ مرۆڤ‌دۆستیمان دەکات، کە ئەم بابەتانە لە چیرۆکەکەی تردا نین و دەرناکەون.

● ئیتر ئەمەندەو خوێندەوارانی بەڕێز، ئاراستەی خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەکەم دەکەم کە ناوم‌ناوە: [بەراووردێکی ویژەیی لە ناوەند چیرۆکی (مەم‌و زین)و چیرۆکی (ئیلیادە)دا]. هیوادارم بەدڵیان بێ و کەلکیشی لێ‌ووەربگرن

**شاکر فتاح**

**(خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد..)**

**سلێمانی: ١٩٨٥/٥/١٣**

# پوختەیەکی مێژوویی لەبابەت ئەحمەدی خانیو بەرهەمە ناوازە زیندووەکەیەوە کە ناوی مەمو زینە

(ئەحمەدی خانی) لە ساڵی (١٦٥٠)دا لە شاری (بایەزید)دا لەدایك بووە، کە کەوتووەتە (کوردستانی تورکیا) وە. لە ساڵی (١٧٠٦)یشدا مردووە. باوکیشی کە ناوی (شێخ ئەلیاس) بووە، لە خێزانێکی خانەدان بووە، کە سەر بە هۆزی (خانیان) بووە، کە لە نزیك شاری (بایەرید)ەوە نیشتەجێبوون. زانستەکانی ئایینو زمانەکانی کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکیو ویژەکانیان لە خوێندنگاکانی ئایینیی شارەکانی (ئورفە)و (ئەخلات)و (بیتلیس)دا فێربووە. چووەتە (سووریە) و (میسر) و (ئەستەموول)یش. بەرهەمەکانی (نیزامی)و (جامی)و (مەلای باتی)و (مەلای جزیری)و (عەلی حەریری)و (فەقێ تیران) یشی خوێندووەتەوەو کە لکی لێوەرگرتوون. دوایی کراوە بە وانابێژ لە (مزگەوتی مواردی‌یە)، لە شاری (بایەزید)دا. پاش ماوەیەك پێگەیشتووەو بووە بە زاناو ویژەوانو بویژو ڕاستیپەرستو خوداناسێکی گەورەی (سۆفی). بە زمانانی کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکی‌یش بەرهەمی داناوە. لە زمانی کوردیدا سێ بەرهەمی هەن کە بە ناوبانگن: (١) : فەرهەنگی (نەوبەهار) کە لە شێوەی هۆنراووەدا بە زمانی کوردیو عەرەبی داینـاوە. لە سالی ١٦٨٣دا تەواوی کردووە. (٢): نووسراوی (عەقیدا ئیمانێ) کە بریتی‌یە لە (٧١) هۆنراوە. (٣): بەرهەمەناوازەکەی: (چیرۆکی مەمو زین) کە لە ساڵی ١٦٩٤دا تەواوی کردووە. ئەم چیرۆکی خانی‌یە بۆ گەلێك زمانی زینوو پەرچڤەکراوە، وەك زمانانی ڕووسیو ئەڵمانیو فەڕەنسزیو تورکیو فارسیو ئەرمەنیو عەرەبی وهەموو جۆرە شێوە زمانەکانی کوردی. یان هەمووی یان بەشێکی زۆرتر لە بیست جار چاپکراوە. ئەوەیش پێویستە بڵێین کە (چیرۆکی مەمو زین)ی نەتەوەیی، چەند سەدەیەك پێش (ئەحمەدی خانی) لە ئارادا بووە. وەك دەڵێن کارەساتی چیرۆکەکە لە ساڵی ١٣٩٣ی زایینی‌دا قەوماوە. بەلام (ئەحمەدی خانی) هێناویتی چیرۆکەکەی سەرلەنووێ داڕشتوتەوە هەموو زانین و چێژکەو شارەزایی‌ی هونەری‌ی خۆی تێدا بەکارهێناوە، تا توانیویتی لە بیروباوڕی پڕولووچ پاکی بکاتەوەو بیکاتە چیرۆکێکی زیندووی وەها، کە لە دڵو دەروونی کووردەواری هاتبێتەدەرەوەو، چێژکەی ڕاستو دوروستو، هۆشی تێ ـ گەیشتوویش پەسەندی‌بکات. چیرۆکەکە بریتی‌یە لە (٢٦٧٣) تاکە هۆنراوە، کە دابەش‌کراون بەسەر (٩٥) بەندداا. لە چوار بەندەکەی سەرەتایدا لەبابەت

ڕێزگرتن و پیشاندانی گەورەیی ی خوداو ڕێزگرتن لە پێغەمبەر پاڕانەوەوە دەدوێ. لە دوو بەندەکەی پاش ئەوبەندانەدا لەبابەت ڕەووشت و خوو نەریتی کوردەواری یەوە قسەدەکات، لەگەڵ باری زرنگ‌کاری و کۆمەلایەتی یدا. (خانی) لەوێدا هۆی پاشکەوتوویی و سەرگەردانی ی (نەتەوەی کورد) دەردەخات لەگەل هۆی پێشکەوتنی و زاڵبوونی بەسەر گیروگرفتەکانیدا. کوردەواری یش ئاراستەدەکات بۆ ئامانجەبەرزەکانی، کە ئەگەر پێیان گەیشت خۆشی ی سەربەستی و ئازادی و سەربەرزی و کامەرانی و تەندوروستی و خۆش گوزەرانی دەچێژێ لەگەڵ ئەندارەی هەرە تەواوی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی دا. هەرچی بەندەکانی تری چیرۆکە کەیشن لە بابەت چیرۆکەکە خۆیەوە دەدوێن. لە بڕانەوەی چیرۆکەکەیشدا، خانی، پاڵەوانەکانی چیرۆکەکەی ئاراستەدەکات بۆ پەناگاهی خودا، بۆ ئەمەی (نەتەوەی کورد) بە هۆی بەکارهێنانی فەرموودەکانی بەرزو پیرۆزی خوداوە، لە ژیانی خۆیدا، بتوانێ بگات بە ئاوات و ئامانجەکانی خۆی. ئەمەیش پێویستە بڵێین کە (خانی) لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەیدا، دەمانناسێنێ بە (پێشکەوتوویی) و (ڕۆشنبیری) و (شارستانێتی) یەکی ڕەسەنی (کوردەواری).

## چیرۆکەکە بە کورتی

چیرۆکی (مەم و زین)، چیرۆکی دڵداری یەکی پاك و بێ گەردە، پیس نەکراوە. لە ئەندازەیەکی هەرە گەورەدا دڵسۆزی و خۆبەخت‌کردنێکی هەردوو دڵدارەکە بۆ یەکتری دەردەکەوێ. یەکێك لە دڵدارەکان ناوی (مەم)ە، کە ڕازنووسی میری جزیرو بۆتان (میر زینەددین) بووە. دڵدارەکەی تریش ناوی (زین)ە، کە خوشکی ئەو (میرزەینە ددین)ە بووە. نیازی (میرزەینە ددین) یش وا بووە، کە خۆشکەکەی خۆی لە ڕازنووسەکەی خۆی مارەبکات. چونکە (مەم) دوستایەتی یەکی گەرم و گوڕی هەبووە لەگەڵ زاوای (میر زەینەددین) دا کە ناوی (تاژدین) بووەو، یەکێکیش بووە لە پاڵەوانە هەرە خوشەویستەکانی میرنوشینی یەکەی. بەلام یەکێکی ناچیزەی دڵ پڕ لە قین بەرامبەر (تاژدین)، کە ناوی (بەکر مەرگەوەڕ) و پەردەداری (میر زەینەددین) دەبێ دەست فڕێ دەداتە کارەوە. لە هەلێکدا کە میرزەینەددین ئاگای لە خۆی نابێ، کار لە دڵی دەکات و خراپ لە دژی (مەم) و (زین) دەیبزوێنێ. دوایی میر زەینەددین وای لێ دێ کە لە هەردوو دڵدارەکە هەڵدەگەڕێتەوەو، بڕیاردەدات کە لە یەکتری مارەنەکرێن. (مەم) دەخاتە بەندیخانەوەو، (زین) یش تا ساڵێکی خشت لەناو ژوورەکەی خۆیدا

کەنەفتدەکات، ئنجا کە دۆستە دڵسۆزەکەی (مەم)، واتا (تاژدین) لەگەڵ کۆمەڵێکی گەورەدا کە بریتیبوون لە براکانیو خزمەکانیو دۆستەکانی، شۆڕشێکی توندو تیژیان بەرپاکرد لە دژی (میر زەینەددین)، لەسەر ئەو زۆرستەمەی کە کردبووی لە (مەم)و (زین)، میر زەینەددین هاتەوە هۆشخۆیو، ڕێگایدا (زین)ی هۆشکی مارەبکرێ لە (مەم)و، (مەم)یش لە زیندان دەربهێنرێو، ئاهەنگێکی گەورەیشیان بەو بۆنەیەوە بۆ بکرێ، هەر بۆ ئەمەی دڵی هەردوو دڵدارەکە بدرێتەوە. بەڵام تا ئەوە ڕوویدا، کار لە کار ترازابوو. چونکە هەردوو دڵدارەکە، تازە کەڵکی ئەوەیان پێوەنەمابوو بژین، ئەوەندە کزو لاوازو نەخۆش بووبوونو، خەمو خەفەت کاری لێکردبوون. یەك دوو ڕۆژێکی پێنەچوو مردن. ئەوەندە هەبوو (زین) وەها داوای (زەینەددین)ی کاکی کرد کە لە دوای مردنیان ئەو ئاهەنگە بگێڕێت، بەڵام بە مەرجێ هەفتەیەکی تەواو درێژەی پێبدرێتو، تاساڵێکی تەواویش لە پێناوی دڵ ڕاگرتنی خوداو کەڵکی خۆیو مێردەکەیدا، کردەوەو کاری چاك بنوێنێ بەرامبەر ئەوانەی لە زینداندانو، ئەوانەی هەژارو داماوو سەرگەرادانو هەناسەساردو لێقەوماون. میریش پێی نا لە گناهەکانو زۆرستەمەکانی خۆی کە بەرامبەر ئەو دوو دڵدارە کردبوونی، کە دی هەردووکیان لەو شێوە پڕئازار ناخۆشییەدا مردن، دەستی کرد بە هەڵڕشتنی فرمێسکی خوێنین. لەبەرئەوە (زین)ی خوشکی هەرچییەکی لێ داواکردبوو، بۆی جێبەجێکرد. هەرچی (بەکر ـ مەرگەوەڕ)ی نارەسەن بوو، لەلایەن دۆستە خۆشەویستەکەی (مەم)ەوە، واتا (تاژدین)ی مەردو دلێرەوە دەستبەجێ کوژرا. ئیتر ئەمەندەو چیرۆکە کە بەوە دواییدێت کە (خانی) پاڵەوانانی چیرۆکەکە ئاراستە دەکات بۆ پەرستنی خودا.

## پرشنگێ بەرامبەر چیرۆکی مەمو زین

ئەو چیرۆکی (مەمو زین)ەی خانی داینەوە، چیرۆکێکی نەتەوەییە، تایبەتییە بە (نەتەوەی کورد). چونکە (ئەحمەدی خانی)، خوداناسییەکەیو، هۆگری یەکەی بە یاسای خوداییەوە پاڵیان پێوەنابوو، کە نەتەوەکەی خۆی واتا (نەتەوەی کورد)و، نیشتمانەکەی (کوردستان)و، (مرۆڤایەتی)ی هەموو، خۆشبوێ. ئەوەیش بوو بە هۆی ئەم (چیرۆکی مەمو زین)ە، لە شێوەیەکی تازەو ناوازەو پەسەنددا دابڕێژێ، کە هەرچی کێشەیەکی زرنگکاریو کۆمەڵایەتی هەیە لەناو (کوردەواری)دا لەگەڵ ئاواتو ئازاری نەتەوەکەماندا تێیدا پیشانبدات.

بێچگەلەوە لە چیرۆکەکەیدا جوانی ی سوروشتی کوردستان و، جوانی ی کچان و کوڕانی کوردەواریمان پیشان دەدات، لەگەڵ ژیانی چینی سەروودا کە پڕە لە کامەرانی و خۆش گوزرانی و، ژیانی چینی خواروودا کە پڕە لە ڕەنج و ئازار هەروەها ئەو کردەوەو ڕەووشت و نەرێتی کوردەوارییەمان پیشان دەدات، کە پڕن لە چاکەو پیاوەتی و بەخشندەیی، لەگەڵ ئەو کردەوەو ڕەووشت و نەرێتەمان کە پڕن لە کەمتەرخەمیی و کەموکووڕی. بێجگە لەوانە ڕۆشنبیری و شارستانێتی ی کوردەواری ی ئەو سەردەمە یشمان پیشان دەدات.

هەرچی (مەم) و (زین) ن، بریتین لە کوڕو کچێکی دیمەن جوان و کردەوە جوان هەردووکیان خاوەنی دەروونی ئازادو، بیروباوەڕی سەربەستن. ئەو دووانە نموونەی نەتەوەی کوردن، کە خانەدانە لە جوانی و ئازایەتی و مەردایەتی دا، لە خۆشەویستی و دۆستایەتی ی پاك و بێ گەرددا، لە گفت و بەڵێن بەجێ هێناندا، لە چاکەدانەوەدا، لە سەرو سامان بەخت کردندا لە پێناو بیروباوەڕی بەرزو پیرۆزدا، هەروەها لە هیواو ئاواتداو، خەبات کردنیش لە پێناوی ئازادی و سەربەرزی دا.

هەروەك (مەم) و (زین)، تووشی نەخۆشی و سەرگەردانی و ماڵ وێرانی بوون بە هۆی زۆروستەمی (میرزەینەددین)، میری (جزیروبۆتان) ەوە، کە نەیهێشت بە کامی خۆیان بگەن و ببنە ژن و مێردو، سەربەستی ی ژیانی ژن ومێردی ی لێ بارکردن، کە ئەوە بوو، ئەمەندە تووشی خەم و خەفەت و ئازارو نەخۆشی بوون ئەنجامیان بە مردن گەیشت... هەروەها (نەتەوەی کورد) یش لە سەردەمی (ئەحمەدی خانی) دا، هێزەداگیرکەرییەکانی (تورکی عوسمانی) و (فارسی) و، زۆرداری ی میرەکانی کوردستان، بە دەردێکی وەهای بردبوو، کە ژیانی کامەرانی و خۆش گوزەرانی و ئازادی و سەربەرزی ی لەدەست چووبوو.

ئەو هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی یەی ئەو سەردەمی تووشی نەتەوەی کورد بووبوو، (خانی) پەیی پێ بردبوو، کە لە زۆرو ستەمی داگیرکەرەکان و زەبروزەنگی میرەکانی خۆمانەوە پەیدابووبوون. (خانی) یش، لەبەرئەوە، ئەو زۆروستەمانە، لەناو چیرۆکەکەیدا کە ناوی ناوە (مەم و زین)، لە شێوەیەکی ئاشکراو دیاردا دەردەخات. (خانی)، زۆرداری ی (میرزەینەددین) و، دڵەرەقەکەی و، تێ نەگەیشتنەکەی و، خۆپەرستی یەکەی و، ترس ولە ززەکەی لەشێوەی ئازاردانەکەی و دڵشکاندنەکەی (مەم) و (زین) دا بە ئاشکرا پیشان دەدات. هەروەها خەباتی پاڵەوان و جەنگاوەرەکان: (تاژدین) و (عارف) و (چەکۆ) کوڕانی (ئەسکەندەر) و دۆستە دڵسۆزەکانیان پیشان دەدات وەك: (مەم) و (زین) و (ستی) و (حەیزە بوون) و (گورگین) ی کوڕی میرزەینەددین و،

پشتیوانە کانیان لە دڵسۆزانی جەماوەرانی کوردەواری، کە ئەوە بوو هەموویان پێکەوە بڕیاریان دابوو: ببن بەیەك، یارمەتی ی یەکتـر بدەن و، خـۆشەویستی بەرامبەر یەکتری بنوێنن و، بە هەموو هێزو هەڕەتێکی خۆیشیانەوە دژی زۆرو ستەمی (میر زەینەددین) بوەستن.

(میر زەینەددین)، کە گوێی نەدەگرت لە ئامۆژگاری یەکانی پاڵەوانە ئازاو مەردو تێگەیشتووەکەی خۆی، (تاژدین)، کە مێردی (ستی)ی خوشکی بوو کە بێجگـە لەوەیش خاوەنی هێـزو دەسەلات و پشتیـوان بـوو، دەچـوو گوێی لە قسەکانی (بەکر مەرگەوەڕ) دەگرت، کە خاوەنی دڵێکی پڕ لەقین و زمانێکی بەدگۆ بوو. بێجگە لەوە کابرایەکی خۆپـەرست و ناپـاکیش بوو، دڵی هـەر بەوە ئـاوی دەخواردەوە کە کەسانی بێ تاوان ئازاربدات وەکو (مەم)و (زین)و (تاژدین)و، ئاگری ئاژاوەو شەڕوشۆڕیش هەڵبیگرسێنێت لەناوەند کەساندا، یـاخود قسـە هەڵبەستێ بۆ کەسانی ترو هانەهانەیان بدات بۆ خراپەکردن.

(میر زەینەددین) یش کە لەم کەینەوبەینەیەدا دڵڕەق خۆی نوواندو، خۆی لادا لە خوداو، لە دادپەروەری و، لە ڕەفتاری زانستی یانە، نەیویست ڕاوێـژ بە کەسێك، یاخود پرس بە کەسێك بکات لەبابەت ئەم گیروگرفتەوە کە کـەوتبووە ناوەند خۆی و (مەم)و (زین)، یـاخود نـاوەند خـۆی و (تاژدین)ەوە. لەبـابەت چۆنیتی ی کردەوەی ئەو دوو دڵدارەیشەوە هیچ لێکۆڵینەوەو پرسیارێکی نەکرد، هیچ چەندوچوونێکی نەکرد. لەجیاتی ی ئەوانە، لەخۆی بایی بوو و، هەڵەشەیی ی دەست پێکرد بەرامبەریان. ئەوە بوو (مەم)ی سەرگەردانی ڕەوانە کرد بۆ ناو زیندان و، خوشکە بەسەزمانەکەیشی، (زین)ی لەناو ژوورەکەی خۆیدا هێشتەوە بە تەنیایی، کە تا ساڵێکی خشتی خایاند. ئەم کردەوە نەنگـەویستانـەی (میر زەینەددین) بوون بە هۆی ئەوەی ئەو دوو دڵدارە بەسەزمـانانـە لەناو خـەم و خەفەت و سزادا بمێننەوەو، نەگەن بە کامی ژن و مێردی پێك گەیشتن، هەتا وایان لێهات ها ئێستا بمرن ها تاوێکی تر. بەڵام ئەو (میر زەینەددین)ە، هەر خـۆی، ناچاربوو، لەژێر باری تەنگەتاو کردنی (شۆڕشی کاریگەری نـەتەوە)دا، کـە بە سەرکردایەتی ی، پاڵەوانی جەنگاوەر (تاژدین)ەوە لە دژی ئەو هەڵگیرسـابوو، ناچار بوو سەر بۆ ماف ڕەواو دادپەوەری و ڕاستی و دوروستی بنەوێنێ. ناچار بوو ئازادی بداتەوە بە هەر دوو دڵدارەکە: واتا بە (دەم)و (زین). هەروەها ناچاریش بـوو کە لە بـەردەمی (زین)ی خوشکی و (مـەم)ی ڕازنـووسی خـۆیـدا پێ لە گوناهەکان و زۆرو ستەمەکانی خۆی بنێ و، داوای (بەخشین) یشیـان لێ بکات.
هەروەها ناچاریش بوو بە دەستی خۆی گوناهەکانی خۆی بشواتـەوە: ڕێ ی دا خوشکە بێ تاوانەکەی خۆی،(زین)، لە ڕازنووسە بێ گوناهە دڵسۆزەکەی خۆی

(مـــه‌م)، مـــاره‌بـكـــرێت. كـــه‌ هـــه‌ردوو دڵداره‌كـــه‌یش مـــردن ده‌ســـتی‌كـــرد به‌جێ‌به‌جێ‌كردنی ئه‌و ئامۆژگاری یانه‌ی كه‌ (زین)ی خوشكی له‌به‌رده‌می ئه‌ودا كردبووی. (میر زه‌ینه‌ددین) به‌ ده‌ستی خۆی لاشه‌كه‌ی (زین)ی هه‌ڵگرت وخستیه‌ ته‌نشت (مه‌م)ه‌وه‌ له‌ناو گۆڕه‌كه‌یدا. داوی ئه‌وه‌ له‌پاش مردنی هه‌ردووكیان چه‌ند ئاهه‌نگێكی ناوازه‌و نایابی گێڕا، به‌ بۆنـــه‌ی ژن‌ومێردی‌ی هـــه‌ردووكیانـــه‌وه‌، كه‌ هه‌فته‌یه‌ كی ته‌واویان خایاند. ئنجا ده‌ستی‌كرد به‌ چاكه‌كردن له‌ گه‌ڵ هه‌ژاران‌و به‌ش‌براوان‌و سه‌ركه‌ردانان‌و سك‌سووتاوان‌و بێ‌باوكان‌و به‌ندی‌یان‌و دیلاندا، كه‌ ئه‌وانه‌یش ساڵێكی ته‌واویان خایاند. (میر زه‌ینه‌ددین)یش كه‌ ئه‌مـــانه‌ی كـــرد، له‌سه‌ر ئاره‌زوو، و خواستی (زین)ی جوانه‌مه‌رگی خوشكی كردی. له‌ڕاستیدا (مـــیر زه‌ینه‌ددین) له‌ ســـه‌ره‌تای كـــاردا پیاوێكی گـــه‌وره‌و تێگه‌یشتـــوو و ئازاو، به‌خشنده‌و، دڵ‌فراوان‌و، دڵپاك‌و زمان‌پاراو بوو. ئه‌وه‌نده‌ هه‌بوو، جاری وا هه‌بوو، ســـه‌ری لێ‌تێكده‌چـــوو، باش له‌ شتی نـــه‌ده‌كۆڵی‌یـــه‌وه‌، دڵیشی نـــاســـك‌بـــوو زوو تێك‌ده‌چووه‌ ئه‌مه‌ بێجگه‌ له‌ خۆپه‌رستی‌یه‌كه‌ی كه‌ له‌ منداڵی‌یدا نازدار فێركرابوو، جا ئه‌مانه‌ هه‌موویان، جاری وا هه‌بوو، پاڵیان پێوه‌ده‌نا بۆ هه‌ڵه‌كردن. یه‌كێك له‌و هه‌ڵانه‌یشی ئه‌وه‌ بوو كه‌ پیاوانی خراپی ده‌كرد به‌ فه‌رمانبه‌ر. (به‌كرمه‌رگه‌وه‌ڕ) یش یه‌كێك بوو له‌و پیاوخراپانه‌. كه‌ كردبووی به‌ په‌رده‌داری دیوانه‌كه‌ی خۆی. میریش وا خۆی ده‌په‌ڕانده‌وه‌ له‌و هه‌ڵانه‌ كه‌ كاروبار هه‌ڵسووڕاندنی میرنوشینی‌یه‌كه‌ی، جاروبار، پێویستی‌ی به‌و جۆره‌ پیاوخراپانه‌ هه‌یه‌ !؟.. به‌ڵام له‌ڕاستیدا وا نیه‌. فه‌رمانبه‌ری خراپ به‌ كه‌ڵكی هیچ فه‌رمانڕه‌وایی‌یه‌ك نایه‌ت. هیچ میرێكیش كه‌ڵك‌و چاكه‌ی له‌و جۆره‌ فه‌رمانبه‌ره‌ خراپانه‌ ده‌ست‌ناكه‌وێت ڕاستی‌یه‌كـــه‌ی ئه‌وه‌تـــا: پێچه‌وانه‌ی ئه‌و بیروبـــاوه‌ڕه‌ی (میر زه‌ینـــه‌ددین)ه‌ ڕاسته‌. چـــونكه‌ ئـــه‌و جۆره‌ فه‌رمانبه‌ره‌ خراپانه‌. نه‌ك هه‌ر بـــه‌ میرنشینی‌یـــه‌كه‌، بـــه‌ڵكو بـــه‌ جه‌مـــاوه‌رانیش زیـــان‌ده‌گه‌یێنن. ئـــه‌م جۆره‌ هـــه‌ڵانه‌یش هـــه‌ر له‌ كوردستـــانی نیشتمانمـــانـــدا ڕووناده‌ن، ته‌نانه‌ت ڕه‌نگه‌ بڵێم، له‌ هه‌موو لایه‌كی جیهانیشدا ڕووده‌ده‌ن. (میری جزیرو بۆتان) یش، كه‌ (به‌كـــرمه‌رگـــه‌وه‌ڕ)ی كردبـــوو به‌ پـــه‌رده‌ داری دیوانی میرنوشینی‌یه‌كه‌ی خۆی، دوایی ئه‌نجامی هه‌ڵه‌ گـــه‌وره‌كه‌ی خـــۆی چێشت. به‌ واتایه‌كی‌تر. میر، ئه‌وه‌ی دوری‌یه‌وه‌ كه‌ به‌ ده‌ستی خۆی چاندبووی !.. داخه‌كه‌م ئه‌نجامیش به‌وه‌ گه‌یشت كه‌ میر، ئه‌و خوشكه‌ جوانه‌ شه‌نگ‌وشۆخه‌ بێ‌هاوتایه‌ی خـــۆی، (زین)ی له‌ده‌ست‌چـــوو. هـــه‌روه‌هـــا (مـــه‌م)یش له‌ده‌ست‌چـــوو، كـــه‌ ڕازنـــووسێكی دڵسۆزی چـــاكه‌خـــوازی ســـه‌ڕاستی بـــوو. بێجگـــه‌ له‌و دووانـــه‌ خۆشه‌یستی‌و ڕێزی سه‌رله‌شكره‌كه‌ی خۆی، (تاژدین)و هه‌موو برا وكه‌س‌و كارو دۆستانی (تاژدین)و جه‌ماوه‌ره‌ شۆڕش گێڕه‌كانی كوردی میرنوشینی‌یـــه‌كه‌یشی

لەدەستچوو !.. تەنانەت کە هۆشیشی هاتەوەبەرخۆیو، وریایشبووەوە، لە توانجوتەشەروڕیسواکردنی (مەم)و (تاژدین)و، (زین)و (ستی) کە هەردووکیان خوشکی خۆیبوون ڕزگاری نەبوو !..

هەرچی (بەکر مەرگەوەڕ) بوو، ئەنجامی بەوە گەیشت کە لەسەر دەستی (تاژدین)دا کوژرا. تاژدین کە بیستبووی (مەم)ی دۆستە خۆشەوبستەکەی لە زینداندا مردووە، ورووژابوو، هەموو جیهانی لێهاتبووە وەیەك، لەداخاندا هوروژمی بردبووە سەر (بەکر مەرگەوەڕ) وکوشتبووی. چونکەبەدگۆیی ی ئەو، (مەم)ی بەو دەردە بردبوو...

شۆڕشە توندوتیژەکەی جەماوەرانی کوردیش، ئەوەندە گڕی سەندبوو، ئەوەندەی نەمابوو، تەختو تاراجی میرنووشینییەکە تێكبداتو، (میر زەینەددین) خۆیشی بکوژرێت !..

جا (ئەحمەدی خانی) لەم چیرۆکەدا، پەندێکمان پێشکەشدەکات، کە ئەویش ئەوەتا: کە هەتا میرەکانو سەرکردەکانمان جۆشو خرۆشی دڵو خۆپەرستییان بیانبەن بەرێوە، هەروەك ئێستا هەن، لە ڕاستیدا دەرگای پشێویو ئاژاوەو چاوڕاو و، دووبەرەکیو شەڕوشۆڕ لەبەردەمماندا دەکەنەوە، کە هەتا هەین لە زیانیان ڕزگار نەبین. کە شەڕو ئاژاوەیش لەناوخۆماندا بەرپابوون، داگیرکەرە ـ بێگانەکان بە یارمەتیی زۆردارەکانی خۆمانەوە، دەرگایان بۆ دەکرێتەوەو، دەتوانن بە ئاسانی بێنە نیشتمانەکەمانەوەو داگیری بکەن. کە ئەو داگیرکەرانەیش گەیشتنەناو خاکەکەمانو گرتیان، دەستدەهاوێژنەناو کاروبارو ئەو بابەتانەوە کە بەکەڵکمان دێن، پەنجە دەوەشێنن لە دوا ڕۆژمانو سەرئەنگرێمان دەکەن. کە ئەو داگیرکەرانەیش نیشتمانەکەیان کەوتە ژێر چنگیانوە وزۆردارەکانی خۆشیمان یارمەتییاندان، ئیتر پێیناوی بیلێین هەرسێ دەردەکە، واتا: (نەخوێندەواری) و (هەژاری) و (نەخۆشي) لەناوماندا بڵاودەبنەوەو، پەرێشانمان‌دەکەن. جا بۆ ئەمەی بتوانین (کوردستان) لەم سەرگەردانی و ماڵوێرانییە، ڕزگاربکەینو، ژینێکی پڕ لە ئازادیو کامەرانیو خۆشگوزەرانی بۆ (کوردەواری) یەکەمان پێكبهێنین، پێویستە لەپێش هەموو شتێکدا، گیروگرفتەکانی فەرمانداریی خۆیی ی خۆمان چارەسەربکەین. پۆیستە فەرمانداریە خۆییەکەمان لەسەر بنچینەی (دادپەروەری) و (یەکسانی) و (سەربەستی) دابمەزرێنین. دوای ئەوە پێویستە هەوڵبدەین بۆ ڕێككەوتنو یەكبوونو خۆشەویستیو، یاریدەدانی یەکتری لەناوەند هێزەکانی (نەتەوەی کورد) دا، ئەویش بە شێوەیەکی وەها کە هەموومان مل کەچبکەین بۆ (دەستوورێکی دادپەروەر) و (پێشنەوایەکی

نیشتمانی ی دادپەروەر تێگەیشتوو)، کە پەتێ ی (یاسای خووایی) بجوولێتەوە. دوای ئەوەیش خەبات بکەین دژی دوژمنەکانمان و، (کوردستان) یش ڕزگاربکەین لەدەست زۆرداری و دیلێتی. کاتێکیش گەیشتین بەم ئامانجانەمان، پێویستە بەرەنگاری ی (نەخوێندەواری) و (هەژاری) و (نەخۆشی) بکەین تا هەموویان لەناودەبەین. ئەمەیش بۆ ئەمەیە کە (نەتەوەی کورد) ژیانێکی سەربەست و ئازادو سەربەزانەبژی و. (کوردستان) یش ئاوەدان ببێتەوەو پڕ ببێ لە چاکەو فەرو خۆش گوزەرانی.

هەرچی (بەکر مەرگەوەڕ) ە، بۆیە کا ناوی هاتووە لە چیرۆکی (مەم و زین) دا، کە پەنجە بکێشرێت بۆ ئەو ناپاکی و پوول پەرستی و خۆپەرستی یە ناپەسەندەی، کە ئێستا لەناو نەتەوەو نیشتمانەکەماندا بڵاوبۆتەوە، کە بە هۆی ئەوانەوە (کوردەواری) یەکەمان تووشی سووکی و ڕیسوایی و لەناوچوون هاتووە هەروەها ئەوە پەنجەیش بۆ ئەوە دەکێشێت کە چاووڕاوو، چەواشەکاری و، گەلەکۆمەکێ لە ئارادا هەن، کە (داگیرکەرەکان) و (زۆردارەکانی ناوخۆ) هەڵیان دەسووڕێنن لە دژی نەتەوەکەمان.

هەرچی کوشتنی (بەکر مەرگەوەڕ) یشە لەلایەن سەرکردەی شۆڕشەکە (تاژدین) ەوە، ئەویش پەنجە بۆ دواڕۆژی (نەتەوەی کورد) دەکێشێت، کە لەناو نیشتمانپەروەرانی کورددا، کەسانی وا خاوەن کردەوەی بڵندو مەردایەتی هەڵدەکەون، کە بتوانن بەسەر پیاو ـ خراپانی ناو کوردستاندا زاڵ بن و لەناویان ببەن. هەروەها ئەوەیش دەگەیێنێ کە دوایی هەر(دادپەروەری) بەسەر (زۆرداری) و (داگیرکەری) دا سەردەکەوێ. بێجگەلەوانە، پەنجەیش بۆ ئەوە دەکێشێت کە نەتەوەی کورد ئەو دەستکەوتانەی دەستی کەوتوون وەك (ئازادی) و (کامەرانی) و (خۆش گوزەرانی) بە هۆی ئەوەوە بووە کە پەیڕەوی ی ئەو (ڕەووشتی مرۆڤایەتی) یەی کردووە کە (یاسای خودایی) پەسەندی دەکات.

بەم ڕەنگە، ئەم جۆرە دەست نیشانکردنەی (ئەحمەدی خانی)، کەلەچیرۆکی (مەم و زین) دا پیشانمانی دەدات، هیواو ئاواتێکی نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی ی وەهامان پێدەبەخشێ کە لە نرخ نایەن. چونکە ئەو گەلەی خەبات بکات لەپێناوی ئامانجەکانی نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی ی خۆیدا، لەشێوەیەك پاڵەوانانەو گیان بەخشانەو مەردانەی ڕاستەقینەدا، بێگومان دەگاتە ئامانجە بڵندەکانی خۆی، لەمەیدانی سەربەرزی و پایەبڵندی دا.

هەرچی پەشیمان بوونەوەی (میر زەینەددین) یشە لە کردەوەو کارە خراپەکانی خۆی کە بەرامبەر (مەم) و (زین) ی کلۆل کردبوونی و،

بەزەیی هاتنەوەی بزووتبوو پێیان و هەرچی خواستێکی ئەو دوو دڵدارە هەبوو بۆی جێبەجێکردبوون، ئەوە دەگەیێنێ کەئەو گەلەی لە پێناوی ئامانجە بەرزو پیرۆزەکانی خۆیدا خەبات بکات و لە سنووری ژیری و تێگەیشتوویی و ئایین و پیاوەتی ی ڕاستەقینەو سەربەرزی نەچێتەدەرەوە، بێگومان سوروشتی سەرداران و پێشەوایان وسەرکردان وەهایە، کە بەناچاری بۆ (ڕاستی)و (دوروستی) و (دادپەروەری) سەردادەنەوێنن و، دەگۆڕێن و بەپێی خواست و پێویستیی یە ڕەواکانیشی دەجوولێنەوەو ڕوویش دەکەنە چاکەخوازی و پیاوەتی و بەخشندەیی، بەرامبەری. ئا بەم ڕەنگە نرخی چیرۆکی (مەم وزین)ی (ئەحمەدی خانی) و گرنگی و کەڵکیمان بۆ دەردەکەوێ، چ لە کۆڕی (زرنگەکاری)دا، چ لە کۆڕی (ڕۆشنبیری) دا، چ لە کۆڕی (کۆمەڵایەتی)و بابەتانی تردا.

چیرۆکی (مەم وزین)، چیرۆکێکی وەهایە، کە هەر وەك گوڵێکی جوان و بۆنداربێ، چاومان پێی دەگەشتێوە، بە واتا زۆرە بە نرخەکانیشی دڵمان دەبووژێتەوە. هەموو دەمێکیش دەتوانین کەڵك و خۆشی ی لێوەربگرین. چونکە واناکانی ڕەووشت و خووی بەرزو پیرۆزو، کردەوەو کاری چاك و پاك و، ڕەفتاری پەسەندمان فێردەکات. هەروەها ڕایشمان دەهێنێ بە (گیانی نیشتمانی) و (بەکارهێنانی یاساکانی خودا) و (پەیڕەوی کردنی کردەوەو کاری مرۆڤایەتی) یەوە.

ئای چەند چیرۆکێکی بەنرخە !

# پوختەیەکی مێژوویی لەبابەت چیرۆکی (ئیلیادە)و (هۆمیرۆسی) خاوەنیەوە

لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا (بیزستراتوس)، فەرمانداری [ئەتینا] فەرمانیدا لیژنەیەکی ڕۆشنبیری یان لە چەند وێژەوان و بوێژێك پێکهێنا، بۆ ئەمەی چیرۆکی [ئیلیادە]و چیرۆکی [ئۆدێسسە] لە دەمی چیرۆك بێژان وەربگرن و بینووسنەوە. بەم کارە هەردوو چیرۆکەکە چوونە ناو مێژووی وێژەوە. پێش ئەو دەمە چیرۆکەکانی (ئیلیادە) و (ئۆدێسە) یان لە دەمی [هۆمیرۆس] بیستبوو، کە ئەویش پیاوێکی چیرۆك بێژو سەرگوزەشتە گێڕەرەوەبوو، دەنگێکی خۆشیشی هەبوو، دەگەڕا بە ناو شارو گوندەکانی یۆنانستاندا و ئەو دوو چیرۆکەی بە گۆرانی یەوە دەگوت بۆ جەماوەران، کەوانجەکەیشی لەگەڵدا لێدەداو دڵی

گوێگرانی پێ‌خۆش‌دەکردن. هەردوو چیرۆکەکەیشی بە هۆنراوەوە دەگوت. تائێستاکەیش ئەو دوو چیرۆکە لە شێوەیەکی جادووگەرانەدا کار لە دڵمان دەکەن. چونکە بە جوانی ی واتاکانیان و زمان پاراوی و ڕۆشتی و ڕەوانی و سووك و سادەیی یان، سەردەمی منداڵی ی مرۆڤایەتی مان بۆ بەرجەستە دەکەن. هەردوو چیرۆکەکە نەتەوەیین. لە بەناوبا نگترین چیرۆکانی یۆنانی و جیهانی دەژمێررێن. لەرووی ویژەو چیرۆکی لاسایی و هەنەرەجیهانی یەکا نیشەوە بە سەرچاوەیەك دادەنرێن. هەرچی (هۆمیرۆس) ە پیاوێکی کوێر بووە. هەندێك هەن بە دانەری ئەو دوو جیرۆکەی دادەنێن. گوایا لە نزیکی ساڵی (٩٠٠) ی پێش زایینـدا بە هۆنراوە هەڵیبەستوون. کەسانی‌تریش هەن لەسەر بوون و نەبوونی (هۆمیرۆس)و، مێژووی دانانی ئەو دوو چیرۆکەو، شوێنی دانانیان، کەوتوونەتە دەمەقاڵی‌یەوە. بەلام ئەم جۆرە دەمەقاڵی‌یانە لە نرخی ئەودوو چیرۆکە کەمناکەنەوە. چونکە ئەمە نزیکەی (٣٠٠٠) ساڵە بەسەر دانانی ئەو دووچیرۆکەدا تێپەڕیوە، کەچی هێشتا لە نێوان ویژەوانان و ویژە دۆستان و ناسیاوانی ویژەدا نرخ و زیندوێتی و گرنگی ی خۆیان پاراستووە. هەرچی (جەنگی ترواده) یە، کەبە هۆی کارەساتی ئەوەوە و، ئەنجامەکانی ئەوەوە، هەردوو چیرۆکەکە دانراون، مێژووی قەومانی دەگەرێتەوە بۆ سەدەکانی یانزەهەم و دەهەمی پێش‌زایین، کە ئەوساکە (شارستانێتی ی مرۆڤ) لە هەرەتی هەرزەکاری‌یدا بووە.

## پوختەی چیرۆکی ئیلیادە

چیرۆکی (ئیلیادە) پڕە لە کارەساتی دڵداری و جەربەزەیی و شەڕو شۆڕو، ناکۆکی و، دووبەرەکی ی ئاشکراو، بەربەرەکانێ لەناوەند پاڵەوانەکانی (ترواده) و (یۆنان)دا، و خوداکانیان و پەیرەوەکانی خوداکانیاندا هەروەها پڕەلە کارەساتی سەهەندەو سامناك و، سەخت و، سەرسوڕهێنەر لەگەڵ ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگ و، بیروباوەڕانی وەها، کە هۆشمان زووربەیان پەسەندناکات و، سەریشمان دەهێننە سەرسوڕمان. ئەم چیرۆکەیش لە شێوەیەکی پان و فراواندا ناوبانگی سەند، تەنانەت گۆڕرایە سەر گەلێك زمانی زیندوو لە جیهاندا، کە زمانی کوردی و عەرەبیش دەگریتەوە. چیرۆکی ئیلیادە خوێندەوار ئاگادار دەکات، لە شێوەی گوزەران و ژیانی خاکەکانی (یۆنان) و (ترواده) و بیروباوەڕو، جۆری

فەرمان - داریيان. نزیکەی دە سالێك شەڕوشۆڕ لەناوەند یۆنانستانو تروادەدا درێژەیسەند. هۆی ئەمەیش ئەوە بوو کە کردەوەکانی شاهزادەی خاکی ترواده کە ناوی (پاریس) ی کوڕی شاه (پریام) بوو پڕ بوو لە سووکی و ڕیسواییو، هەڵشەیی، لەچێژکەی مەردانە پەسەندی دەکرد، ئە مەندیو زرنگی، نە دادپەروەری، نە چاکەدانەوە. نە ڕەووشتیڕێزگرتن لە کەسانیتر. شاهزادە (پاریس) بە خۆیو دەسوپێوەندیەوە، لە ناکاو سواری کەشتییەكبوو، و دەستیکرد بە گەشت وگوزار بەناو دەریای یۆناندا. زۆری پێ نەچوو گەرداوێکی توندوتیژی تووش‌بوو، خۆیانو کەشتییەکەیانی سەرەوژێرکرد. کاتێکیش (پاریس) هۆشیهاتەوەبەخۆی، خۆی دی بە ڕووتی یەوە فڕێدراوەتەسەر پارچە زەوییەك، لە کەناری زێی یۆناندا نە کەسی لێیە، نە دەسوپێوەندەکانیشی دیارن. بەڵام بەختی یار بوو چەند ئافرەتێك لە خێزانی شاهی (ئیسپارتە) بە لایدا تێپەڕین هەندێ پڕوپیتاڵیان پێبەخشی، توانی لەبەریان‌بکاتو لەشی خۆی داپۆشێ. دوای ئەوەیش بردیان بۆ بەردەم شاهی ئیسپارتە، کەناوی (مینیلاوس) بوو. شاهی ئیسپارتەیش بە دڵفراوانییەکەوە پێشوازیی کرد، میوانداریيەکی جوانی کرد ڕێزێکی وایشی لێگرت کە شایستە بێ لە شاهێکەوە بۆ شاهزادەیەکی خاکێکی تر بکرێت.

کەچی شاهزادەی ترواده، پێچەوانەی ئەوجووڵایەوە. بەرامبەرئەو شاهە چاکە، (مینیلاوس)، ناپاکیی کرد. لە جیاتیی چاکەدانەوەی، چوو ژنەکەی شاەمینیلاوس، (هێلین) ی هەڵفریواندو، فڕاندی لەگەڵ خۆیداو، چووەوە خاکەکەی خۆی، (ترواده)، کە لە (ئاسیای بچووك) دابوو. (پاریس) بەم کردەوەیەی، بۆ هەموو لایەك خۆی دەرخست، کە پیاوێکی سپڵەو خوێڕیو کردەوە نەنگە، لەوانەیش نیە کە چاو لە تاوانەکانی بپۆشرێ. هەرچی شاهژنی ئیسپارتە، (هێلین) بوو، ئەمەندە جوانو شەنگو شۆخ بوو، هەزاران دڵی گرفتاری ئەڤینی خۆی دەکرد. شاهی ئیسپارتە (مینیلاوس) زۆرخۆشی دەویست. لەبەرئەوە ئەم کارەساتی ژن هەڵگرتنە، کە ناپاکیی ژنومێردیی لێدەنکاو، بۆ دڵداریيەکی نەنگو هیچوپووچ قەومابوو، دڵی هەموو خونکارانو فەرمانداران و، جەماوەرانی یۆنستانی وورووژاند، بۆ کەڵکی (شاه مینیلاوس) تەنانەت هي ئەوانەیش کە ناکۆكو ناحەزی یەکتریيش بوون. هەموویان بە زەییيان بە مینیلاوسی بەسەرزماندادەهاتەوە. لەبەرئەوە لەشکرێکی گەورەی بێ‌شومار ئامادەکراو، لەهەزار کەشتیدا سوارکرانو ڕوویانکردە خاکی (ترواده)، تا بچن بە گژیداو، سزایبدەنو، (هێلین) ی شاهژنیشی لێبستێننەوە. لەپاش چەند شەڕێکیش کە نزیکەی دە سالی خاياند و، دوامین شەڕیان ناوی (شەڕی ترواده)

بوو شاری ترواده داگیرکرا و کەوتە دەست یۆنانی یەکان و، شاهژن (هێلین) ی لێسێنرایەوە. بەڵام تا ئەمە پێکهات بە کلوور کەس لە هەردوولا کوژرا و، شاری ترواده وێران کرا لەگەڵ شارەکان و گوندەکانی تەنشتیدا و، دانیشتووەکانیان ئازاردران و ڕیسوا کارن و زیانیان لێدرا. هەروەها تاڵان کردن و ئافرەت بردنیش لە هەموو لایەکی ئەو خاکەدا ڕوویدا.

## پرشنگێ بەرامبەر چیرۆکی ئیلیادە

● هەرچەندە لەپێش ڕوودانی کارەساتی چیرۆکی ئیلیادەدا بە چەند سەدەیەک ئایینەکانی ئاسمانی هاتوونەتە خوارەوەو پێغەمبەرەکانی خودایش پەیدابوون، هەروەك لە ناوەرۆکی ئەو چیرۆکەدا دەردەکەوێت. خاکی یۆنان هیچ بیروباوەڕێکی تێدا پەیدا نەبووە لە بابەت تاك‌وتەنیایی ی (خودا) وە. کەواتە نابێ سەرمان لەوە سوڕ بمێنێ کە گەلێك (خودا) و (خوداژن) لە ناوەرۆکی چیرۆکی ئیلیادەدا ببینین وەك: (زێفس) کە گەورەی خوداکان بووەو، (ئەتینا) کە خودای تێکەیشتوویی بووەو، (ئەفرۆدیت) کەخودای جوانی بووە. (هیرا) ی خوداژنیش، ژنی (زێفس) بووە، (ڤۆلکان) یش کوڕی (زێفس) و (هیرا) بووە. هەرچی (تیتس)یشە کەبە فریشتەی زرێ دادەنرێ دایکی یەکێکە لە پاڵەوانانی چیرۆکەکە و، خونکارێکی یۆنانی کە ناوی (ئەشیل) بووە. بەڵام [ئارس] بە خودای جەنگ دانراوە.. یۆنانی یەکانیش باوەڕیان وابوو، کە خوداکان و خوداژنەکان کردەوەو ڕەووشتیان وەك هیی مرۆڤ وایە. هەرئەوەندەجیاوازن لە مرۆڤ کە هەر زیندوون و هەرگیز نامرن، هێزو دەسەڵاتیشیان لە هی مرۆڤ زۆرترە، لەمەیشەوە تێدەگەین کە ئەو خوداو خوداژنانە کردەوەوکاری چاکیشیان لێدەوەشتێتەوەو، کردەوەو کاری خراپشیان لێدەوەشێتەوە، کە نە دەبوو لێیان بوەشایەتەوە. هەروەك لەم چرۆکەدا چاومان پێدەکەوێ، ئەو خوداو خودا ژنانە، لە کاتی شەڕەکاندا، دەستدەکەن بە دوژمنایەتی و، پیلان دانان بۆ یەکتری. هی وایشیان تێدایە، کردەوەو کاری هەرە خراپ و هەرە پیسی لێ ـ دەوەشێتەوە، وەك (ئارس) کە خوادی جەنگ بووە.

ئەوەندە هەیە، هەرچەندە ئەو خوداو خوداژنانە، لە بابەتانی دروست کراوو هەڵبەستراو دادەنرێن و، لە ڕووداوو لەڕاستیدا لە ئارادا نەبوون، بەڵام دوور نیە کارەساتی (شەڕی ترواده)، لەڕاستیدا ڕوویان دابێ، چونکە تەنانەت

ئەو جێماوانەی کۆنیش کە تازە دوزراونەتەوە لە ژێرگلدا، پەنجە بۆ ئەوە دەکێشن کە ئەو شەڕە قەومابێ.

هەرچەندە فڕاندنی ژنی شاهی ئیسپارتە، (هیلین)، لە لایەن شاهزادەی خوێڕی‌یەوە، (پاریس) بەتاوانێکی گەورە دادەنرێ‌و هەر سەر بە خونکار (مینلاوس) دانانەوێنێ، سەر بە هەموو یۆنانی‌یەکانیش دادەنەوێنێ، بەلام‌من لەو باوەڕەدام، کە خونکار (مینیلاوس) دەیتوانی تۆڵەی خۆی لەو شاهزادە بەدخووە (پاریس) و ئەو ڕەدووکەوتووەناپاکە (هێلین) بکاتەوە، بێ‌ئەمەی‌بچێتە ناو ئەو جەنگانەوەکە نزیکەی دەساڵیان خایاندو، بە دەیان هەزاران‌کەسیان تێدا کوژرا بێجگە لە کاوول کردنی شاران‌و گوندان‌و، فڕاندنی ئافرەتان‌و گرتن‌و بردن‌و تالانی‌و زۆرو ستەمانی‌تر کە لە ناو هەردوو خاکی‌دروا‌سێ‌ی یەکتردا کران.
هەروەها خونکار (پریام) یش دەیتوانی سزای‌کوڕەدڕندەکەی خۆی (پاریس) بداتو (هێلین) ی ڕفێنراویش بنێرێتەوە بۆ کن مێردەکەی خۆی کەناوی (مینیلاوس) بوو، لە گەڵ پیشاندانی‌پەشیمانی‌و خەم‌و خەفەتدا بۆئەو کارەساتە ناهەموارەی کە کوڕە هەرزەکارەکەی قەوماندبووی‌و، پێشکەش‌کردنی هەندێ دیاری‌ی ناوازەکەشایستەی خونکار (مینیلاوس) بێ. ئەویش بۆ ئەمەی تۆڵەبۆ خونکاری یۆنان بکاتەوەو، مەیدانی جەنگیش نەدات کە بقەومێ لە ناوەند هەردوولایاندا، تائەو هەموو خوێنانە نەڕژێن‌و ئەو خاکانەی هەر دوولایشیان ئەوەندە وێران نەبن.
جاچونکە هیچ کامێکیان ئەوەیان نەکرد، هەردوولایان بە بەرپرسیار دادەنرێن بەرامبەر ئەو حوێنانەی ڕژان لە هەردوولاداو، ئەو زیانە گەورانەی کەوتن لە هەردوولایان. چونکەهەردووکیان بە دوو خونکاری خۆپەرست دادەنرێن، کە کەڵکی چاکەی خۆیان‌و گەورەیی‌یە بۆش‌و بەتاڵەکەی خۆیان، پێش کەڵک‌و چاکەی نەتەوەکانی خۆیان خست. بۆچ نەدەکرا ئەو گیروگرفت‌و گێشەیە، لە شێوەیەکی بێ‌وەیدا چارەبکەن‌و، بەهۆی چەند خونکارێکی چاکەخوزاو بێ لایەن‌و بەرێزەوە، ناوبژی‌ی هەردوولایان بکەن ؟!..

● هەوێنی ئەم چیرۆکە بریتی‌یە لەو دڵداری‌یەی کە پەیدابووەلە ناوەند شاهزادەی سپڵەو خوێڕی‌دا، (پاریس) شاەژنی ناپاك (هێلین) دا. بەلام‌ئەمە چۆن دڵداری‌یەکە کەبگاتە ئەوەی داوێن‌پیسی‌و ناپاکی‌و سپڵەیی‌ی لێ‌پەیدابێ، کە لە سەر دەستی هەردوو دڵداردا ڕوویان‌داوەو زیانیان بە خونکارێکی میوان نەوازو چاکەخوازو، مێردێکی خۆشەویست‌و دڵسۆز گەیاندبێ ؟!
ئایا خونکار (مینیلاوس) یش چۆن دڵی بەرایی‌ی‌دا، ژنێکی وا سپڵەناپاك سەرلەنوێ بگێڕێتەوە بۆ خۆی‌و، لەترواد‌ی‌یەکانی بسێنێتەوە ؟!.. کەتەماشای

چیرۆکەکەیش دەکەین، هیچ لەو بابەتەوە نادوێ کەلەپاش ئەمەی (هێلین) دراوەتەوە دەست خونکار (مینیلاوس) ی مێردی، چی ی لێ کراوە، یاخود چی ی بەسەر هاتووە ؟! بەڕاستیی ئەمەشتێکی سەیرە، پیاو سەری لێ ی سورڕدەمێنێ ..!

هەروەها لە چیرۆکەکەدا چارەنووسی شاهزادە خوێری یەکە، (پاریس) پیشان نادات، کە چی ی بەسەرهاتووە. ئەوەندەهەیەلە چیرۆکەنەتەوەیی یەکانی ترەوە ئەوەتێ دەگەین، کە (پاریس) ئەمەی بە دزی یەوە، پاڵەوانەیۆنانی یەکە، (ئەشیل)، دەکوژێ، خۆیشی لە پاش ماوەیەکی کەم دەکوژرێتەوە.

# بەراووردکردنێکی ویژەیی لەناوەند چیرۆکی (مەموزین) و چیرۆکی (ئیلیادە)دا

(١) : هەوێنی هەردوو چیرۆکەکە (دڵداری) یە. بەلام ئەو دڵداری یەی لە چیرۆکی (مەموزین) دایە، دڵداری یەکی پاك و بێگەردە پیس نەکراوە. بەلام ئەو (دڵداری) یەی لە چیرۆکی (ئیلیادە) دایە دڵداری یەکی نەنگ و گەنگ و ناپەسەندە. چونکە فڕاندن و ناپاکی ی ژن و مێردی و داوێن پیسی ی لێ پەیدابووە. (دڵداری) لە چیرۆکی (مەموزین) دا بووەهۆی ئەوەی: ئارام و ئاسایش و سەربلندی و چاکەکردن لەگەڵ هەژاران و سەرگەردانان و لێقەوماوان و داماوان و دیل و بەندی ی لێ پەیدابێ لەگەڵ چاکەی گشتیی دا. بەلام دڵداری لە چیرۆکی (ئیلیادە) دا بووە هۆی ئەوەی: جەنگ و ناوبانگی حراپ و ریسوایی و کوشتنی دەیان هەزاران لە هەردوولای لێ پەیدا ببێ لە گەل کاوول بوونی خاکی هەردوولادا بێجگەلەبردن و گرتن و تالانی وژن بەدیل گرتن.

(٢) : لە چیرۆکی (مەمزین) دا خودایەکی چاکی پاکی تاك و تەنیاو بێ هاوتا دەبنیین، کەهەر بووەو هەر دەبێ و، دوورە لە هەموو کەموکووڕی یەکەوە، بە چنگەو خاوەن دەسەلاتیشە بەسەر هەموو ئافەریدەکراوێدا، گەورەیەو سەرچاوەی چاکەوفەرەبوهەموولایەك. دادپەروەری دەنوێنێ و، بەزەیی ی بەکزو بێچارەو داماو و هەژارو لێقەوماواندا دێتەوەو، دەکەوێتەفریایان. هەروەها بەرەنگاری، زۆرو ستەم و ناهەمواری دەکات. بەلام لە چیرۆکێ (ئیلیادە) دا، گەلێك خوداو خوداژن، دەبنیین کە لە ڕاستیدا نەبوون و نین. کردەوەو کاری

چاکیان هەیەو، کردەوەو کاری خراپیشیان هەیە، چەشنی مرۆڤانی سەرزەمین، بەڵامڵەو جۆرە خوادایەنین کە دەسەڵاتیان بەسەر هەموو شتێکدا هەبێ، یاخود دووربن لە کردەوەو کاری خراپو ناپەسەندەوە. ئەوخوداو خوداژنانەی لە چیرۆکی ئیلیادەدا ناویان براوە، دەستێکی باڵایان هەبوو لە وێرانکردنو زۆرو ستەمو تاڵانکردنو ژن داگیرکردنی جەنگەکانی (تروادە) دا. ئەوانە بە زیندوێتی دەمێننەوە بەڵام زۆر کۆن نین، لەسەرەتای ژیاندا نەبوون.

(٣) : هەردوو چیرۆکەکە بە زمانێکی وێژەیی ی پێشکەوتووو شیرینو خۆش نووسراون، مرۆڤ کێش دەکەن بۆ خوێندنەوەیان. هەرچی چیرۆکی (مەموزین)ە، بریتی یە لە (٢٦٧٣) تاکەهۆنراوە، کە دابەش کراوە بەسەر (٩٥) بەنددا. (ئەحمەدی خانی) کە یەکێك بووە لە دانیشتوانی شاری (بایەزید) لە کوردستانی تورکیادا، لە ساڵی (١٦٩٤)ی زاییندا، لەسەر بنچینەیەکی زانستو ڕاستیی پەرستیو هوشو ڕووداو، کە دووربێ لە بیروباوەڕی پروپووچەوە، تەواوی کردووە. دوایی ی چیرۆکەکە بەوەدەهێنێ، کەڕێزو گەورەیی ی ئەو خو دایەپیشان دەدات، کە پاڵەوانە خوداناسەکانی ناوچیرۆکەکە لە خەمو خەفەتو، ئازارو، خوێنڕشتنو، سووکیو ڕیسوایی ڕزگاردەکات، کەبەهۆی ئەوەوە جەماوەرانی کورد لە میرنوشینیی (جزیر وبوتان) دا کەلكو فەڕێکی زۆرگەورەیان دەستدەکەوێ. (مەموزین) چیرۆکێکی کوردییە، لە دڵیجەماوەرانی کوردو، چاکەیگشت لایەنیانەوە هەڵقوڵاوە، کارەساتەکانیشی وەك دەڵێن ساڵی (١٣٩٣) ی زاییندا قەومان.
هەرچیچیرۆکی (ئیلیادە) یە، چیرۆکێکی یۆنانییە، کارەساتەکانی، وەكدەڵێن لەناوەند سەدەکانی یانزەهەمو دەهەمی پێش زاییندا قەوماون. بەڵاملەسەدەی پێنجەم پێشزاییندا تۆمارکراوەو ناوی چووەتە مێژووی وێژەوە. وەكدەڵێنلە لایەن گۆرانیبێژێکی کوێریشەوە دانراوەکە ناوی (هۆمیرۆس) بووە. لەم ڕووەوە دووبەرەکی کەوتووەتە ناوەند نووسەرانو وێژەوانانەوە، لەبابەت بوونی کەسایەتیی هۆمیرۆسو، ئەو سەردەمەی چیرۆکەکەی تێدا دانراواەو، ئەو جێگایەی چیرۆکەکەی تێدا دانراوەو، ئەو سەردەمەی چیرۆکەکەی تێدا دانراوەو، ئەو جێگایەی چیرۆکەکەی تێدا دانراوەو، ئەو کەسەی چیرۆکەکەی داناوە. چیرۆکەکە بریتییە لە (١٦٠٠) تاکەهۆنراوە. کەدابەشکراون بە سەر (٢٤) بەشدا، بە شدا، بەزمانی یۆنانییش دانراوە. کارەساتی چیرۆکەکەیش لە خاکی یۆنانو خاکی (ئیلیۆن) دا قەوماون کەکەوتووەتە ناوپارچەزەوییەکەوەناوی (ترواده) بووە. چیرۆکەکەیش پڕە لە قسەی پروپووچو ڕیژگاوی، بەوەیش داویی ی دێت، کە هەردوو خاکەکە وێراندەبنو،

خوێنیکی یەجگار زۆریان تێدا دەڕژێو، خوێنیکی یەجگار زۆریان تێدا دەڕژێو، سسوکیو ڕیسوایییش بەر هەردوولایان دەکەوێ. هەروەها چیرۆکەکە پڕەلە دووبەرەکییەکی گەورەو، گیروگرفێتکی پڕ ئازاوەو تەنگکو چەڵەمە، لەناوەند پاڵەوانانی چیرۆکەکەو خوداکانو ژنخوداکاندا کە یە جگار زۆرن. لە ناوەرۆکی چیرۆکی (ئیلیادە) یشەوە دەردەکەوێ کە جاماوەرانی (یۆنان)و جەماوەرانی شاری (ئیلیۆن)، هیچکەڵکو چاکەیەکیان پێنەبڕاوە. بە پێچەوانەوەهەرچی ئازارو سەرگەردانییو، خوێنڕشتنو ڕیسواییو، هەموو زۆرداریەك هەیە، کە بۆسەر ئابڕوو، و سامانو نیشتمان کراون تێیاندا ڕوویانداوە. ئەمانەیش هەموو بە هۆی خۆپەرستیی (پاریس) ی شاهزادەو، (هێلین) ی شاهژنو، (مینیلاوس) ی شاهی ئیسپارتەو، (پریام) ی خونکاری (ترواده) وەڕوویانداوە.

(٤) : لە چیرۆکی (مەموزین) دا (میرزەینەددین) مان وادێنەپێش چاو کە دوو فرمانی پێچەوانەی یەکتری جێبەجێدەکات. یەکێکیان ناڕەوایە. ئەویشئەوەتا کە (مەم) دەخاتە زیندانەوەو، (زین) یش ئەو ماوە درێژە کە ساڵێك دەخاێنێ کەنەفت دەکات. یەکێکیشیان ڕەوایە، کە ئەوەتا: مل کەچ دەکات بۆ فەرمانی ئایینی ئیسلامی کە دادپەروەریو بەزەیی هاتنەوەو، ڕاستیودروستیو، کەڵکی گشتی دەگرێتەوە، لەگەڵ خوشكو برایەتیدا. ئەنجامەکانی ئەم کردەوەیەی دوایی ی (میرزەینەددین) کەڵكو خۆشیو کامەرانیڕکی زۆری بەخشیبە (مەم)و (زین) و جەماوەرانی کورد. هەرچی هەڵوێستی خونکاری (ئیسچارتە)، مینیلاوسو، خونکاریترواده (پریام)و، شاهزادەی ترواده (پاریس)و، شاهژنی یۆنانی ڕەدووکەوتووە، (هێلین) بوو، هەموو ناڕەوا بوون. لەبەرئەوە ئەنجامەکانیان بەوەگەیشتن کە ئازارێکی زۆرو زیانێکی زۆرتووشی جەماوەرانی (یۆنان)و (ئیلیۆن) بێن.

(٥) : فرۆفێڵی هونەریی ناسكو جوان، لەهەردوو چیرۆکەکەدا دەردەکەون. لە چیرۆکی (مەموزین)دا، (مەم) و (تاژدین) جلی خۆیان دەگۆڕنو جلی ژنان لەبەردەکەن، لەکاتی ئاهەنگی جەژنی نەورۆزدا. هەر لەو ڕۆژەیشدا بە ڕێکەوت (زین)و (ستی) ی خوشکیشی جلی خۆیان دەگۆڕنو، جلی پیاوان لەبەر دەکەن. هەروەها (حەیزەبوون) یش کە دایەنی (زین) و (ستی) بوو جلی خۆی گۆڕیو، جلی پیاوانی لەبەرکرد، خۆی خستە شێوەی پزیشکێکی پیاوەوە. ئەنجامی ئەم کردەوانەیش بە دڵخۆشیو سەرکەوتنو کامەرانی گەیشت بۆ هەموویان. چونکە ئەوفرۆفێڵە ڕەنگینانە کە هونەرمەندییان تێدا ئاشکرا بوو، بوونبەهۆی ئەوەی، ئەو دوو کوڕە لاوەو، ئەو دوو کچەهەرزەکارە. یەکتری ببینن و یەکتریبناسنو،

بپارێزن له براکوژیو، کاوول‌بوونو، نه‌ته‌وه‌که‌مانو میـرنوشینی‌یـه‌که‌یشمـان سه‌ریان‌به‌رزببێته‌وه.

هـه‌رچی چیرۆکی (ئیلیـاده) یه،ئـه‌سپێکی دارینه‌ی گـه‌وره‌ی له لایه‌ن هونه‌رمه‌ندانی یۆنانی‌یـه‌کانـه‌وه‌تێدا دوروست‌کـراوه‌و، پاڵه‌وانـه‌یه‌کـانی تێدا شاراوه‌ته‌وه. ئنجا یۆنانی‌یه‌کان‌به‌فێڵ خۆیان واپیشان ده‌ده‌ن، که ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌بۆ خـاکی خـۆیـان ئـه‌و ئـه‌سپـه‌یش‌بـه‌جێ‌ده‌هێڵین بـۆ (تـراوده‌یی) یـه‌کـان. تراوادەیی‌یه‌کانیش‌به‌بابه‌تی تالانیو سه‌رکه‌وتنی خۆیانی داده‌نێن که ئه‌سپه‌که ده‌به‌نه‌ناو شاره‌که‌یانه‌وه‌که (ئیلیۆن) بوو. ئه‌م‌فێڵه‌یش بوو به‌هۆی گرتنی شاری تـرواده له لایه‌ن له شکـری یۆنـانه‌وه‌و، کـاوول کردنی شـاره‌که‌و. کـوشتنی دانشتووه‌کانیو سه‌رگه‌ردانی‌ی تروادەیی یه‌کانو سه‌که‌رتنی یۆنانی‌یه‌کـان‌له گێرانه‌وه‌ی شاهژنه داوێن‌پیسه‌کـه‌یانـداکه هێڵین ـوو. جا هــه‌ر وه‌ك له‌ڕردوو چیرۆکه‌که‌دا ده‌رده‌که‌وێ، فڕوفێڵه هونه‌ری‌یه‌کان له چیرۆکی (مـه‌مو زین) دا چاکه‌و خۆشی‌یان لێ‌په‌یدا ده‌بێ، که‌چی له چیرۆکی (ئیلیاده) دا زیانو خۆشی‌یان لێ‌په‌یدا ده‌بێ.

(٦) پاڵ‌وانه‌کانی چیرۆکی (مه‌مو زین)، په‌رده‌داری میر، (به‌کر مه‌رگه‌وه‌ڕ) ی لێ‌ده‌ربچێ، هه‌موویان خاوه‌نی که‌سایه‌تی‌یه‌کی به هێزو هه‌ڕه‌تو، جوامێـریان هه‌یه، که خوێنده‌واران ده‌هێننه‌سه‌رسوڕمان. چونکه کرده‌وه‌و کاریان جوانه‌و، ده‌روونیان پاکه‌و پیرۆزه‌و خۆیشیان به‌خت‌ده‌که‌ن له‌پێناوی که‌ڵکو چاکـه‌ی که‌سانی ترو گشتیی‌دا له‌به‌رئه‌وه شایسته‌ی ڕێزو نـازگرتنو، هــه‌ڵیش‌ده‌گرن خوێنده‌وارانی چیرۆکه‌که چاویان لێ‌بکه‌ن.

به‌لام پاڵه‌وانــه‌کانی چیـرۆکی (ئیلیاده)، کـرده‌وه‌و کاره‌کـانیان پـڕن له نـاڕه‌واییو خۆپـه‌رستیو زۆرداری چونکـه بوون بـه‌هۆی ئـه‌وه‌ی دوو خاکی گـه‌وره‌ی پێشکه‌وتـوو کاوول‌ببن. له‌بـه‌رئه‌وه هیچیـان له‌وانه نـین هــه‌ڵبگـرن خوێنده‌واران چیرۆکه‌که چاویان لێ‌بکه‌ن.

(٧) : ئنجابه پێی ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ی له‌مه‌وپیش کردمان، من له‌و باوه‌ڕه‌دام که چیرۆکی (مه‌موزین)، له ڕووی گیانیو، وێژه‌ییو، زانستیو، ڕۆشنبیری‌یه‌وه، له چیرۆکی (ئیلیاده) بارستایی‌ی به‌رزتره‌و، بـه‌کێشانـه‌یش گرانتـره. ئه‌مـه‌یش سـه‌باره‌ت بـه‌وه‌یه کـه چیرۆکی (مـه‌مو زین) ڕاستگۆییو، چـاکـه‌دانـه‌وه‌و، خۆبه‌خت‌کردن له‌پێناوی فرمانی پێویست‌داو، هۆگربوون بـه هه‌مـوو کرده‌وه‌و ڕه‌ووشتێکی پاكو پیرۆزو به‌رزه‌وه‌و، په‌یڕه‌وی‌کردنی (ئایینی پاکی ئیسـلام)و،

پاراستنی کەڵكو چاکەی گشتیمان فێردەکات. کەچیی ئەم جۆرە کردەوەو کارە باشو پەسەندانە لە چیرۆکی (ئیلیادە) دا نابینین، بە پێچەوانەوە، هەر گیانی تۆڵەسەندنەوەو، خۆپەرستیو، زۆرداریو، چاوچنۆکیو، چاوچڵیسیو، داوێنپیسیو، پشمو قینو، دوژمنایەتی دەبینین.

## سەرچاوەکان

---


(١) : نووسراوی (چیرۆکی مەمو زین لە تەرازوودا) ـ شاکر فتاح

(٢) : نووسراوی (ئیلیادە) و (ئۆدیسسە) ـ هۆمیرۆس ـ پەرچڤەی شاکر فتاح

(٣) : نووسراوی (مەمو زین) ـ أحمد الخانی ـ ترجمة محمد سعید رمضان نثراً باللغة العربیة ـ سنة ١٩٥٧ مطبعة الترقی ـ دمشق.

(٤) : نووسراوی (مێژووی ئەدەبی کوردی) ـ عەلائەددین سوجادی چاپخانەی مەعاریف، بەغداد ساڵی ١٩٥٢ ز.

(٥) : نووسراوی (الألیاذة) هومیروس ـ ترجمة عنبره سلام الخالدی نثراً الی اللغة العربیة ـ الطبعة الخامسة ـ بیروت ـ دار العلم للملایین ـ سنة ١٩٨٢ م.

کورتە چیرۆك

# برسیەتی

حیدر حیدر

وەرگێڕانی
ئەسعەد عەدۆ

سپێدەیەك مندالّەكە بەدایكی وت: دایە بڕوانە ئەم پاپۆڕانە، دەریاكەیان قووتدا ! ئەی لە كوێ مەلە بكەین ؟

دایكەكەی دایە قاقای پێكەنین.. مندالّەكەش لە پرسیار كردن بەردەوام بوو، دایە ماشێنەكانی سوپایی لە ژێر دارەكان نوستوون ! ئەی چۆلەكەكان لە كوێ دەخەون ؟!

دایكی ڕووی گرژ بوو، هەردوو برۆكانی لێك نزیك كردنەوەو هاواری كرد: كوڕە ئەو چ دەلێی ؟

كوڕەكە گوتی: دایە، باوكم وتی ئەو گەنمەی بـۆ تۆدانی زەویـەكـەمـان هەلّگرتووە، دەیكەمە ئارد.. ئەگەر وایكرد لە رۆژانی بارانا زەویەكـەمان چ لە باوەشیدا دەگرێ ؟

دایكە ڕایكردە ژووری ناندینو بە هەناسە سـواری پەنجـەرەكەی كـە كەوتبووە سەر دەریاكە.. والآی كردەوە.

* * *

کوندەبۆیەك بەدڵدارەکەی وت: لەبەرچی مێردم پێناکەی ؟
دڵدارەکەی گوتی: باڵندەیەکی ترم خۆش دەوێ !
کوندە بۆیەکە وتی: بەڵام من زۆر خۆشتم دەوێ !
دڵدارەکەی گوتی: تۆ هەژاری، جگە لەم کاولە خانووەو دوو چاوی زەق و دوو باڵی بەتین هیچی تر شك نابەی !
کوندەبۆیەکە بە مەلولیەوە وتی: من ئەم کاولە خانووە خۆشەت پێشکەش دەکەم، بۆ ئەوەی بەخۆشی تیایا بژین، ئەی دەزگیرانە دەوڵەمەنـدەکەت چیت دەداتێ ؟
دڵدارەکەی باڵەکانی خۆی لێك کردەوە، بەفیزەوە پێکەنی، ها.. ها.. ها، خۆشەویستە دەوڵەمەندەکەم شارێکی پڕ کاولە خانووم پێشکەش دەکا ئەگەر خوا تەمەنی خاوەن شکۆ درێژ بکا !
کوندەبۆیەکە لە شەقەی باڵیدا.. لەو کاتەی چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون، بڵند بوو، وتی: وا لە شاری خاوەن شکۆ دەچمەدەر، چونکە خۆشەویستی تیـا بەدی ناکەم، بەڵام ڕۆژێك دادێ نەبەردێك نەپەلە دارێك بەدی ناکەی لە سەری هەڵبنیشی، ئینجا یادم دەکەیتەوە.

* * *

لەگەڵ ڕۆژئاوادا پیاوەکە لە کارکردن بە ماندوویەتی گەڕایەوە ماڵ، دەم و دەستی خۆی شوشت و داوای لە خێزانەکەی کرد کە خواردنی بۆ ئامادە بکا..
خێزانەکەشی نانێکی تیری و کەمێـك زەیتوون و هێلکـەیەکی کـوڵاوی لە پێش دانا. پیاوەکە لەسەرخۆ دەستی کردە نان خواردن..
ئافرەتەکەی پێی گوت: ئەوە بۆ وەك جاران هەواڵی (وافد) ناپرسی ؟
پیاوەکە هوشیار بووە، بەڕاستی ئەمڕۆ ماندووم.. ئەی کوا ؟
- نوستووە، بەڵام لێی دەترسم !
- بۆ ؟
- قسەی ترسناك دەکا، یاسین تۆ بڵێی گیانی ئادەمیزاد ببپەڕێتە ئادەمیزادێکی تر ؟!
یاسین زەردەخەنەیەکی هاتە سەر لێوی، لەو کاتەی کاوێژی بە پاروە نانێك دەکردو گوتی: ئەم پرسیارە بێ مانایە چیە ؟
ئافرەتەکە وتی: وافد منداڵ نیە، بەڵام قسەی وا دەکا زۆر لە خۆی زل ترە !
باوکی وافد دەستی لە نان خواردن هەڵگرت و دەمی سڕیەوەو گوتی: هەموو منداڵێك وا بەزەحمەت گەورە دەبێ.

* * *

# دزەکان

لە هێرشێك لە هێرشە دڕندەکانی دوژمن بـۆ سەر شـارو گونـدەکانـدا، فڕۆکەوانی قارەمان (جەرجس حەنناوی)، شەڕە فڕۆکەیەکی مەردانەی لەگەڵ فڕۆکەکانی دوژمندا کرد.. لە ئەنجامدا وەك (باز) کەوتە سەر لووتکە چیاکانی نزیك دەریاکە.

تەرمەکەیان بە ئاهەنگێکی گەورە هێنایەوە گوندەکە.

لە پێش دەرگـایماڵێکی دەشتـەکی هەژار، بـاوك و دایکی ڕاوەستان و تلیلەیەکیان لێدا !

پیاوێك پرسی: سەیـرە، بڕوانـە چۆن تلیلە لێـدەدەن.. وەك بڵێی بـووك گواستنەوەیە !

پیاوێکی ترگوتی: ئایا دەزانی ئەم جەنگاوەرە تاقانەیەو لە خانـەوادەیەکی هەژاری ئەم گوندەن ؟! دەڵێی بۆ ئەم ڕۆژەیان پەروەردە کردبوو.

پیاوەکەی تر گوتی: لەم ڕۆژە زیاتر چی ؟ گونیە ئاردێك بە پەنجا لیرەیە !

پیاوەکەی تر بەپێکەنینەوە: دەکاتە سەد لیرە گەر خوا تەمەنی خاوەن شکۆ درێژ بکا !

ڕێژنە گوللەیەك بە بۆنەی ناشتنی شـەهیدی پـاڵەوان هاوێشتـرا، بەڵام گوللەیەك شوێنی خۆی لە پشتی پیاوە دەم بەپێکەنینەکە کردەوە !

* * *

بازاڕی شارەکە بازاڕێکی پان و درێژ بوو، لەو سەری تائەو سەری شارەکەی گرتبوو.. مزگەوتێکی گەورەو بەرزیش لە ناوەڕاستی بازاڕەکە بوو. لە بازاڕ هەموو شتێك هەبوو بۆ فرۆشتن تا ئادەمیزادیش !!

جوتیاری هەژار بەترسەوە بەدوای کوندەبۆ دەگەڕا، هەر جارەی پرسیاری دەکرد گاڵتەیان پێ دەکرد ! پرسیاری لە پیاوێکی کۆچەری وەك خۆی هەژار کرد: دەبێ لە کوێ باڵندەی بەند کراو بفرۆشن ؟

کۆچەرەکەش دەستی بۆ پێچی شەقامی بازاڕەکە درێژ کرد، بەرەو پێچەکە ڕۆیشت، کاتێ لە پێچەکە سووڕایەوە ڕوو بە ڕووی کۆگایەکی گەورە بـوو، کە لەبەر دەرگاکەی ئەم ئایەتەی پێ هەڵواسرابوو [المال والبنون زينة الحياة الدنيا] چووە ژوورەوە، چاوی بەچەندان قەفەسی شوشەیی و ئاسنی کەوت، چەنـدان باڵندەی ڕەنگاو ڕەنگی تیا بەند کرابوو، هەر وەك کۆگاکە بە کۆتاڵی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازا بۆوە.

بۆ بەیانی باوکی وافد بەرەو کاری خۆی دەڕۆیشت.. وافد لێی پرسی:
باوە، ئایا باوکەکان درۆ دەکەن ؟!
باوکەکەیشی وتی: نەخێر.
وافد گوتی: ئەوە هەفتەیەکە پێم دەڵێی کوندەبۆیەکت بۆ دێنم و کەچی تا ئێستاش هیچ !
- ڕۆڵە چیت لە کوندەبۆیە ؟
- دەنگیم پێ خۆشە !!
باوکی وتی: من لە کوێ کوندەبۆت بۆ بکڕم.. لەو کاتەی برسیەتی لە دەرگای هەموو ماڵێك دەدا ؟
منداڵەکە وتی: لە نێو بازاڕی شارەکەمان بەند کراوە، تۆیش لە بەندیخانەی رزگار دەکەی !
باوکی هاواری کرد: چۆن دەزانی...؟
وافد گوتی: چونکە شەوان لەسەر دار زەیتوونەکان ناخوێنێ !
باوکەکەی بەزەردەخەنەیەکەوە کوڕەکەی لە باوەشدا گرت و بۆنی کردو گوتی:
بۆتی دێنم گیانەکەم.. بۆ گەیشتنەوەیەکی تر..
منداڵەکەش بەدەستە ناسك و بچکۆلەکانی خواحافیزی لێ دەکرد.. ئەگەر ئەم جارەیش درۆم لەگەڵدا بکەی، لە دوای باوکێکی تر دەگەڕێم !

جوتیارەکە لە بازرگانە قەڵەوەکەی پرسی: کوندەبۆتان هەیە بۆ فرۆشتن ؟
بازرگانەکەش وتی: هەموو جۆرمان هەیە !
- نرخی چەندە ؟
- بۆ تۆ پەنجا لیرەیە، بەڵام بۆ یەکێ تر حەفتایە، چونکە وا دیارە پیاوێکی هەژاری و پێویستە کۆمەك بکرێی.
جوتیارەکە سەری سووڕما ! لە دڵی خۆیدا قینی لە منداڵەکەی هەڵساو گوتی: ئەو منداڵانە گڕنە لە شت دەگرن.
لەو کاتەدا ئەفسەرێك هاتە کۆگاکە، بازرگانەکەیش لەسەرپەك پێ ڕاوەستاو بەخێر هاتنی کرد: بەخێر بێیت، گەورەت کردین، کۆگاکەت رووناك کردەوە، فەرموو لەخزمەتین، کۆگاکە کۆگای خۆتە، کورسیێکی بۆ داناوو بانگی منداڵە خزمەتکارەکەی کرد: وەرە کوڕە بڕوانە گەورەت چی گەرەکە.. فەرموو قوربان سارد، گەرم ؟
ئەفسەرەکەیش بەفیزەوە گوتی: نسکافە

بازرگانەکە وتی: بەڕاستی شەڕێکی مەردانە بوو، بەخوا گەورەم سەرت بڵند کردین.. خوا تەمەنی خاوەن شکۆمان درێژ بکات.

ئەفسەرەکە سیگارێکی (کەنت)ی، داگیرساندو گوتی: فڕۆکەمان زۆر کەوتو زۆریشمان لێ کوژران، بەلاّم نەمانهێشتن بگەنە ئامانج !

یاسینی جوتیار وەکو بەرد ڕاوەستابوو، گوێی لە قسەکان ڕاگرتبوو، نسکافە هاتو خواردرایەوە، لە دواییدا بە دوو قۆڵی چوونە ژوورێکی تری کۆگاکە.. کەمێك مانەوە، ئینجا بە پێکەنین هاتنەدەر، کەل‌و پەلی بەنرخ نێردرایە نێو (مرسیدس)ە، ڕەشەکەی پێش دەرگای کۆگاکە !!

ئەفسەرەکەویستی بڕوا..

لە پێش دەرگاکە ڕووی وەرگێڕا.. بینی کوندەبۆی بەستەزمان لە نێو قەفەسەکەدا نوستووە، گوتی: حەسانی کوڕم داوای کوندەبۆیەکی لێم کردوە، داخوازی ئەو مندالانە سەیرە ! نازانم بۆ باڵندەیان خۆش دەوێ ؟ بازرگانەکە بەسەر خزمەتکارەکەی قیڕاند: کورە ئەو قەفەسە بخەرە نێو ماشێنی باوکی حەسان !

جوتیارەکە بەم دیمەنە زیاتر سەری لێ شێوا، کاتێ بینی کوندەبۆی بەندکراو لە کۆگاکە دەرچوو، دڵی زۆر توند بوو، لەپێش خۆیدا وتی: باڵندەیش وەردەگرن !

* * *

## پیاو کوژەکان

وافد یاسین گەورە بوو، بووە قوتابییەکی کۆلێجی چەکی ئاسمانی لەو بەشەی کە بە نێوی شەهید جەرجس حەنناوی بوو، لە دوای سێ ساڵ بوو بە فڕۆکەوان.

هەموو ڕۆژێك لە ئاسمان مەشقی بە فڕۆکەکەی دەکردو خۆی بە هەڵۆ دەهاتە بەر چاو، بەلاّم ئەو هەڵۆیەی کە هیچی نەئەبینی جگە لە بازاڕو کۆشکی خاوەن شکۆ.

له ڕۆژێکی ساماڵدا هه‌ڵۆ به فڕۆکه جه‌نگیه‌که‌ی به‌رز بۆوه بۆ ئـاسمان، چه‌ند جارێك به‌سه‌ر شاره‌که‌هاتوو چۆی کرد، خۆی پێ ڕانه‌گیرا، به‌ره‌و بازاڕ هاته خوار.. به‌ردوومانی کرد ! ئینجا به‌ره‌و کۆشکی خاوه‌ن شکۆ خزی ئه‌ویشی وێران کردو بڵند بۆوه.. له کاتی هه‌ڵسانه‌وه‌ی چوار فڕۆکه به‌رانگـاری بوون و داوایان لێ ی کرد که خۆی بداته ده‌ست به‌ڵام بۆی نه‌سلماندن، به‌ره‌و شـاخه بڵنده‌کان ڕۆیشت بۆ ئه‌وه‌ی خواحافیزی له باوکی بکا..

له‌و کاته‌ی به‌سه‌ر لووتکه شاخه‌کانی لێوار ده‌ریاکه ده‌فڕی، که‌وته بـه‌ر لووله‌ی سارۆخی دوژمن، فڕۆکه‌که‌ی پێکاو له ئه‌نجامدا سوتا، وه‌ك هه‌ڵۆیه‌کی باڵ شکاو به‌سه‌ر شاخه‌کانی لێوار ده‌ریاکه که‌وته خواره‌وه.

---

له کۆمه‌ڵه چیرۆکی «الفیضان»ی
حیدر حیدر
وه‌رگیراوه. وزاره الاعلام -
دار الحریه للطباعه ۱۹۷٦

# «بازنەی ڕۆژانی هەینی»

**هاشم ئەحمەد سەڕاج**

تەکانی دایە خۆو.. ئەمجارەیان بە سووکی کەوتەسەرگازی پشت.. یەکسەر هەستی بەوەکرد کە هەینەی ئارەقە داری هەتا دێ زیاتر بروسکە ئەکاو پەنگر ئاسا تا ووزەی گەرمایی ئەبەخشێتە گیان و لەشی.. بەلاّم خۆی ڕاتەکاندو بەزەبری پێیەکانی بەتانیە قاوەییەکەی هەلماڵی.. دەستی چەپەی درێژکردو توند پاکەت و شقارتەکەی هەلگرت.. پەشتەماڵە مۆرەکەش هەر بە گەچراوی‌یەوە...

مارانە برینەکەی سەر گەردنی پەنهان کردبوو... هەڵسایە سەر پێو کەمێ لە ڕۆحی شتەکان وردبووەوە... ئەوەی کە زیاتر سەرنجی ڕاکێشا.. کاتژمێرە هەڵواسراوەکەی سەر ڕووی دیواری ژوورەکەبوو... دێر زەمانێکە.. بەدەم هەشتو نیوەوە نووستووە.. کێ دەڵێ ئامێرە وردیلانەکان ژەنگیان هەڵنەهێناوەو نەسواون.. لەوەتەی هەم ئەم میلە زەبەللاحەو ئەو سەعات ژمێرە قوتو قاوەیی‌یە دەخولێننەوە.. هۆدا.. دەبا ئێمەش ڕۆن پژێنیان کەین..؟ نەء.. دڵم کاتژمێری لەشی شەکەتمەو کاتژمێری پیرۆزیش قەت سڵ ناکات لە ئەژماردنی تەمەنی شەکەتانو ناسرەوێ.. هەندێ لە ووشەکان تامو بۆی خەوی دوێنێ شەویان لێ ئەتکا.. خەریك بو هەلاژێ.. بەلام هەتا بەر هەیوانەکە گیر نەبو.. لە نکاوڕا لە باوەشی ئەسکەملێکی پلاستیکیا ڕوونیشت.. چاو خەوالو بوو.. بۆنو بەرەکەتی بێداری‌و شەونخونی لا ڕوومەتەکانی تەلخ کردبوون.. زۆر بەهێمنیەوە پەشتەماڵەکەی خستە بن ئانیشکی و ئازارەکانی سەربەست بوون.. جگەرەیەکی داگیرساند.. دوو مژەی بەقەوەتی لێداو.. خستیە نێوان پەنجەکانیەوە.. دیسان بە هێمنیەوە لە توێژی قەدی دار (زەردەلو) ەکەی نزیك بن هەیوانەکە ڕاما، سێ کەلێنی کەوتبووێ.. شارە مۆرانەش لە سەمای ژەهراوییانەیان نەدەکەوتن.. سەعات (هەشت) ی ڕەت کردبو.. چرە دووکەڵ داو کلافەیان دەبەستو ڕووەو تەوقەسەر ئاوا دەبوون.. خۆی گوڕی‌و بەدەم ئاوێنەکەدا ڕاوەستا.. سەیری ناو چاوەکانی خۆی کرد.. سوور هەڵگەڕا بوون.. کەوتە قژ داهێنان.. پەیوەندیەکی هەمیشەیی لە گەڵ شانە بازنەیی‌یەکەیدا هەبوو.. گورج هەر گۆرەوی‌یەکانی دوێنێی لەپێ هەڵکێشا.. بە پارچە پەڕۆیێ تۆزو گەردی ڕووی کەوشەکانی داماڵی‌و بەڕێ کەوت.. لە دورەوە لمووزی ماشێنە پرتەقاڵی‌یە بیستو... نەفەری‌یەکەوە دیار کەوت... ووڕوژا.. هەرکە ستۆپی کردو نەکرد.. یەکسەر خۆی تێکوتاو بە خوڕتی لە بەرامبەر شوفێرەکە دا نیمچە شوێنێکی داگیر کرد.. هەردوو چاووی ئاراستەی جوولەی دەستو سووکانەکەو لەرینەوەی گوڵە نایلۆنە کەسكو سوورە هەڵواسراوەکان کرد.. بیرۆکەی قەد بڕی ڕێگا گەمارۆی دا.. تێر تەماشای میلی کاتژمێرەکەی کرد.. مۆرکی شێتایەتی لێ بەدی دەکرا.. نمرەیەك تەنگی‌ی قایشەکەی شلکردەوە، مەچەکی حەسایەوە.. لەو لاشەوە ڕستە تەسبیحێکی دنکە قەزوانی ملوانکە ئاسا.. ڕووەو دەفەی سینگی سفتو سپی‌ی (خواژنێ) شۆڕ ببووەوەو قوتە ئیمامۆکەی بە لیچە ئارەقەیەکی سیکۆتینی بە پێستی چەرمۆڵەیی وەنوسابو... شەقڵو سیمای گەردانەیەکی خوایی ئەنواند.. هۆگری کوشێنی ماشێنەکە ببو... بست بە بست ئاشنایەتی لەگەڵ بەرگە جەلاتینە نەرمو شلکەکانا کرد بوو.. چەند

هەڵویستەیەکی کردو ڕەوتی گواستنەوە بەردەوام بو.. زۆر بە دیقەت تەماشای ڕیزە دووکانەکانی بەردەرکی حەمامەکەی کرد.. گڕی دەروونی هێور نەبووەوە.. وەك هەموو ڕۆژانی تر (قەبرستان) پێشوازی لێ کرد.. ئەمجارەیان لە دڵ ڕا ئاخێکی بۆ هەڵکێشاو چپاندی:

مسئەستێرەی ترۆپ بەیداخی قەفەس.. ژەنگدارە ئێستاکە.. سێهەمین کەس بوو لە گۆڕەپانەکەدا دابەزی.. هەراو زەناو جەنجاڵیو بازاڕی جگەرە فرۆشان کەللەی سەریان کاس کرد.. خەریك بو بە چوستی لە بواری جاددە بپەڕێتەوە.. گڵۆپە سوورەکە هەڵگیرسا.. دوو هەنگاو بەرەو دوواوە گەڕایەوە.. ئەمجارەیان پێی لێ ناو هەتا دوورِ چاخانەکە ڕانەوەستا.. سەیرێکی ڕاستو چەپی خۆی کردو لەبنە بانێ هەڵتروشکا.. بەلەز ئاوڕێکی بەرەو دەستە چەپ دایەوە گڵۆڵە پارە چەکەرەی دەکردو لێزمە سوور دەچووەوە... دیارە گەرمەی قومارە.. دەڵێی مرۆیەکانی جارانن.. بەڕاستی کەشکۆڵێکی سەیرو سەمەرەیە.. جۆرەها بەرگو پۆشاکی گرتۆتە باوەش.. هەوێنی بەختەوەریی دوا ڕۆژی لەناو بۆتەی گیانی هەڵگرتووە.. خەفەت مەخۆ.. مۆرە هەڵباوێ.. سەیری دەستو پلی خۆکەو.. دوو سبەیش هەر مۆرە هەڵباوێ ـ ئاگری حەز تەنگی پێ هەڵچنیون هەر کە سەری هەڵبڕی.. بنمیچە مێژوویی یەکە درزی کەوتبوێ.. زۆر بەووردی لە تاقو دینگەکان ڕاما.. غوربەتی هاتێ.. دەیزانی هەرامەو قنکە جغارە بەر کورسی یەکانی تەنیوەتەوە.. لە وشەی چاوی وێنەی ناو چوار چێوە زەبەللاحەکەدا زەردە خەنەیێ سوور دەبریسکایەوە، ڕەنگی ناو سكو دەمارە لولپێچەکانی کرمی ڕەشو ووردیلەی بن پێلوە تەنکەکانیەتی هێڵنجی هاتێ.. وەخت بوو بڕشێتەوە هەر چابو چەند سێبەرێکی بەدی کرد.. ئاوەژوور.. کەوتن.. زۆر چاکە بازنەی ئیمڕۆش تەواو دەبێ.. هەمان دابو نەریت.. دووبارە بۆوە.... لەو لاشەوە هەتا دەهات قەوارەی گڵۆڵە گەورەتر دەبووە... بەڵام سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا.. وەك گیانی گەرمی تاقو بنمیچە کۆنینەکان.. دەمەتەقێ دەستی پێکرد.. مشتو مڕێکی سەیرە.. لە نێو قەدەوە دەس بە باسەکان دەکرا.. گوێ ڕایەڵ بوون.. مۆسیقای دەردەنگی ووشە بەرەو ئەو دیو هەڵدەکشا.. هەردوو بازنە لە قوڵایی دەریاچەی (کات)ێ مەلەیان دەکرد.. جار جار ڕازو نیازی دڵیان بۆیەکدی هەڵدەڕشت.. جاریش هەبوو دوو چاری کشو ماتیەکی کوشندانە دەبوون.. زۆری نەخایاندو تووێژێکی دوو قوڵی هاتە کایەوە:

- چما لێرەی ؟.. دەمێکە

- دووکەڵ هەناسەی لێ بڕیوم، هەر وەختە چاوم دەرێ..

ـ سوور هەڵگەڕاون، زەرتکی جغارە دەپار زنن.. تەمەن دریژی بو تنو.
زەرەندی دەخوازن..
ـ دوور مەبینە.. چاوانت ببن بە فلتەرە جغارەو نەشیزانین.
ـ ئەوەندە تروسکاییان تیاماوە.. پەتای شەو کویری بەزینن.
ـ دەنا با سووری بدەین..
هەتا دەهات هەردوو بازنەکان ڕێك‌و پێکتر دەبوون.. پلەی تیرە برکی لە چەقەکاندا یەکسان بوون.. جار جار لووتکەی ڕێکی دەهاتەکایەوە.. لەولاشەوە جمکە ئەلقەلێك هەڵدەشاخان، چڕی دەرداوی نەزۆکی تیر تر دەبوو.. زرەو زرینگەی پیاڵەو سەمای کەوچك جوانی بەخش بوون.. هۆگریەتی لە تەختە ڕەقی کورسی یەکان‌و تیلمە حەسیری پەراگەندەو بریقەی ووشکایەتی ڕووی میزو خوانەکانەوە دەسپێدەکات.. شارە عومرێکی حەشار دراون.. پەیتا پەیتا لەگەل خرڕەی زارەکانا گلۆڵە بچووك دەبووەو چێوەی بازنەش یەك پەتاقە زارێکی شەشپالوی بچکۆلانە دا دەپچڕاو زریزە بۆشاییش جێ‌و شوێنی دەگرتنەوە.. ئینجا خشەی مالین‌و ترپەی پێ تێکە لاوی یەکتر دەبوون.. تەقەی (پەنجا) فلس تێ گرتن لە سینیە بڕۆنزیەکەیا.. ئاوازێکی ڕەسەن بو.. مۆسیقای دابڕان.. بەشەقامەکان وەر بوون.. ئەوانیش بە جووتە چەق‌و چێوەی بازنەی خولانەوەیان بڕی بوو.. ئێستاو ئێستاش نەگەڕاونەتەوە.. ئاگری جغارە پەشتەماڵە مۆرەکەی بەرباد کردبوو.. هەر بەقەد پولە دۆمینەیێ پێجامە هێلدارەکەی سووتاندبوو.. بو سوکاری لە مۆخی کردبوو.. لە پڕ ڕانی گەرمایی گەیشتی‌و ڕاچەنی.. لە کەلێنی دار زەردەلوەکەدا هەموو شتێ ئاشکراو ڕوون بوو.. جووتێ پیروزە شینەی شێدار.. ئاگرێکی کەسك‌و پاقژی ئەفسووناوی وەك ئەوەی لە مس‌و قورقوشمی تواوە هەڵبقولێ.. تیایان دەیسکایەوە.. چ چاو برکێ یێ.. خەریك بو گیانیان هاو پارچە بێ.. کەروێشکەکەش لەتەك مێرگی سەوزە فریزەکەدا لەززەتدار بوو.. زوبانی عاردی دەماڵی‌و جار جار مووی سمێلی زبری لە کەلێنی تویژی قەدی درەختیلەکەیا دەسووی هەتا داکەسێ.. ئینجا بە جارێ دەروونی حەسایەوە.. چونکی لە چەمکی زۆر شتان حاڵی بو.. جا لە سەرەخۆ هەر بەئاگری پێجامەکەی سەرە نووکی (نیو) جغارەکەی داگیرساندو ئینجا بە گوژمی ڕانەکانی لە ڕۆحەوە دایمرکاند.....

١٩٨٤/٤/٨

# خۆزگە خوازی

نووسینی
عثمان حمد احمد
١٩٨٥/٨/٢٥
بەغدا

هێندەی برسی بوو، خۆی بۆ نەگیرا تاکو دایکە پیرەی نانی بۆ بێنێ... سەر شێتانە نانێکی تیری کردە دوو پارۆو قووتی داو لگەنێکی شلە سواری فرکرد، بە پەلە پەل شەلوارە پینە کراوەکەی لە بەرکردو سوولە هەڵپچڕاوی لەپێی کرد، ڕێی قوتابخانەی گرتە بەر... بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە دەریای ئەنجام وەرگرتندا مەلەی دەکرد، بە سەدان جۆر بیری دەکردەوە (خوا نەخواستە)... نا نا... زۆر باش وەلامم داوەتەوە، سەرکەوتنم مسۆوگەرە .

ئیش و کاری سێ مانگەی پشوودانی هاوینە قوڕ کاری بوو... هەر ڕۆژەی هەزار خشتی دەبڕی... هەستی بە گەرمیو ساردی نەدەکرد، ماندو بوون لە لەشیا سڕابووە...!!

لە چاوەکانیا دەیەها وێنەو تابلۆ بەدی دەکرا... لە جیهانێکی سەیر هەنگاوی لێك گرێ دەدا. بەوبایە باڵی بگرتایەو لە ژووری بەرێوەبەر بنیشتایە...!! بە سەدان بەڵێنو وەعد، لە مێشکی چینگلەی دەکرد... چڵەی درەختەکانی قەراخ شەقام بە لارو لەنجەوە سەمایان سازدابوو. دۆستو هاو دەمی یەکتر بوون چەندین یادگارو رازو نیاز لە ژێر هەر درەختێکە نەخشاندرا بوو...!! هەریەکە دەیویست بۆ ژێر سێبەری ڕای بکێشێتو پشووەك دەر بکات، زیاتر لە ڕۆیشتندا خوی توندتر کردو دەیووت:... ووشە بە نرخ و جوانەکانی باوکم قەت لەیاد ناکەم، (کوڕم هەموو ئاواتو خواستم ئەوەیە خوێندن تەواو بکەیتو ببیت بە مووچەخۆرو مرۆڤێکی سود بەخش لە نێو کۆمەڵدا).

- دوور نیە ئێستاکی «نەحشین» لە ژووانی دێرینا چاوەڕوانی تێپەڕبوونم بێت... بۆ ئەم ڕۆژە لەمن بە جۆشترە نا هەقی ناگرم دەردی عاشقی گرانە، یا خوا کەس تووشی نەبێت... بە دەیەها بروسکەی هەمە جۆر تیژ بە مێشکیدا تێپەڕ دەبوون.

له نه‌خشه‌ی دڵه پڕ خواست و ئاواته‌که‌یدا وای دانابوو، پێش هه‌موو شتێك باوکه نه‌ساغه‌که‌ی چاره‌سه‌ر بکات و ئه‌و چه‌ن ساڵه‌ی که ماویه‌تی بحه‌سێته‌وه.

- (چۆن ئه‌و ڕۆژه ڕه‌شه‌م له یاد ده‌چێته‌وه که باوکه بێ هێزه‌که‌م له ڕۆژانی ساردو زوقمی زستاندا بۆ کرێکاری ده‌ر ده‌چوو، له ژێر لێفه دڕاوه‌که‌مدا زه‌ینم ده‌دایی، چۆن نانه ڕه‌قه‌یه‌کی ده‌ئاخنه گیرفانی پاڵتۆیه بێ قوڵه‌که‌ی... داخه‌که‌م که زستان داده‌هات هه‌رچی‌یه‌کی هه‌ی بوو له‌به‌ری ده‌کرد...!! چ‌ۆن بۆچه‌ژن تێر برنج و گۆشتمان ده‌خوارد، خوا کاری خه‌ڵکی ئاوایی ڕاست بێنێ، به درێژایی ته‌مه‌نما یه‌ك دانه‌که‌وشی هه‌بوو ئه‌ویش نیوه‌ی قاچی له ده‌ره‌وه بوو ؟! خۆ دایکه هه‌ش به سه‌ره‌که‌م هه‌ر هیچ...!!

باوکم گه‌لێ گه‌لێ له‌و پۆشته‌تر بوو، به خه‌یاڵم نایه‌ت ڕۆژی له ڕۆژان دایکم جل و به‌رگێکی تازه‌ی پۆشیبێ. دونیایه‌کی سه‌یره...!! ئه‌م چه‌شنه مرۆڤانه‌ش پێیان ده‌ڵێین مرۆڤ... ته‌نانه‌ت به دیمه‌ن مرۆڤن...!! هاوینان چۆن چووجه‌ڵه له قه‌پێڵك ده‌ر ده‌چێت ئێمه‌ش ئاوا له لێفه کۆنه‌و جل و به‌رگه شڕو دڕاوه‌کانمان ده‌ر ده‌چووین... پێچگه‌له سه‌دان ده‌رده سه‌ری ژیان و ڕۆژگار. خۆزگه سه‌د خۆزگه به ئاوات و خواستی باوه ده‌گه‌م... مه‌رج بێ به شاره‌زاترین پزیشك نیشانی بده‌م هه‌موو په‌یداویشتێکی ماڵه‌وه به زیاده‌وه دابین یکه‌م... پیاو نه‌بم ئه‌گه‌ر جل و به‌رگێکی کوێخانه‌ی له‌به‌ر نه‌که‌م... دایکه به‌سه‌زمانه‌که) ده‌بێ ببێته پۆشترین ئافره‌تی گه‌ڕه‌که‌که‌مان، ئاغا ژن بۆ ئاغا ژن...!؟ دوای ئه‌م هه‌موو خواست و ئاواتانه نۆره‌ی نه‌خشین دێ، ئه‌و گوڵه‌ی که به سه‌دان شه‌و به ئاواتی‌یه‌وه سه‌رم ناوه‌ته‌وه، دوو دڵ به ڕازو نیاز ده‌گه‌ن... قسه خۆشه‌کانی ژێر، دره‌خنه‌کان سه‌وز ده‌به‌ن و ڕه‌گی ئه‌به‌دی ده‌ڕوێنن. کاکه لاو له‌م ئه‌ندێشه پڕ ترس و له‌رزه‌دا هه‌نگاوی ده‌نا، نه‌یده‌زانی چۆن ڕێ ده‌کا، له ناوکاودا دوو هاوڕێ‌ی بانگیان کرد.

- کاکه لاو هه‌واڵێکی دڵته زێنمان بیستووه... ئایا تووش بیستووته.؟
- نه‌خێر ئه‌م هه‌واڵه چۆن هه‌واڵێکه ؟!
- ده‌ترسین ڕاسته‌و ڕاست بیدرکێنن..!!
- ز ووکه‌ن بیڵێن دڵم تووقی !؟
- نه‌خشین تۆ خۆش.

هه‌رکه ئه‌م ووشه دڵته‌زێنه‌یان له ده‌م ده‌رچوو دونیای ڕووناکی لێ بووه شه‌وو که‌وته خواره‌وه‌و لاتێکی زه‌وی گرت.

* * *

عبدالله صالح شارباژێڕی

هەر کە دانیشت، لە بەردەمما
تەزویەکی سارد، هات بەسەرما
دانیشتنی، سستی کردم
هۆش و هەست و بیری بردم
نەرمۆلەو جوان، وەکو پەری
دەستی خستە، سەر کە مەری
بەچاوی ڕەش، خەندەی سەر لێو
حاڵی کردم، سەرسام پەشێو
وەك فریشتەی، زەوی و ئاسمان
هێواش، هێواش، هاتە زمان
ووتی ـ بەسە، غەم و پەستی
تۆ مرۆڤ و، خاوەن هەستی
پەل بهاوە، بۆ گشت لایە
ژیان بێ ژان، قەت پێك نایە
هەست ڕاگرە، بۆ گوفتارم
سەرنج بدە، لە گوڵزارم
ئەو گوڵزارەی، وەك بەهەشتە
پڕ سەمایەو، پڕ لە گەشتە
تێر بڕوانە، بۆ خەت و خاڵ
ئەشنێ بۆ تۆ بەشنەی شەماڵ
بۆنی خۆشتر، لە گوڵاڵە
شێخ و مەلا، بۆی عەوداڵە

ئێستا هانام، بۆت هێناوە
ئەم جوانییەی من، بەهۆنراوە
وەك ملوانکە، بیکە ملت
هەر بۆ یادگار، تامردنت
منیش پەردەی، شەرمم دڕی
لەبەر گەرمی، کڵپەی گڕی
پەڕوو باڵم، وەك پەروانە
هەلکوڕووزا، بەو، ووشانە
ووتم ـ ئەی شۆخ، دڵ و گیانم
ئەی فریشتەی، خەمەکانم
خۆت ئەزانی، کەشێتی تۆم

**٢٤/ حوزەیرانی/ ١٩٨٥**

بۆت ئەسووتێم، هەر وەکو مۆم
وەك پەروانە، بۆ جوانی تۆ
دڵم پڕە، لە ئاخ و سۆ
وێنەی بولبول، عاشق بەگوڵ
بۆ تۆ ئەگریم، بە سۆزی دڵ
وەکو لاو لاو، بەرەو باڵات
هەر هەڵئەزنێم، دەگەمە لات
لەپەنجەی پێت، تا تەوقی سەر
خۆم پەخشئەکەم، وەك خێرو شەڕ
کە ئەمبینی، ئەز غەمبارم
لەم ژیانەش، کە بیزارم

خواردن و خەوم، گشت کات غەم
ئاسوی ژینم، پڕ لەتەمە
بێ ئارامم، لەم ژیانە
باوەڕ بکە، توخوا گیانە
کێ بێ ئەمڕۆ، غەمی نەبێ ؟
تووشی قورت و، هەلدێر نەبێ ؟
بەلام گیانە، تۆ بزانە
هۆشی شاعیر، پڕ ویژدانە
غەم و سۆزی، بۆ هەموانە
بێ ئارامە، لەم جیهانە
هەتا گشت لا، سەربەست نەبێ
کەل و کۆمەڵ، ئازاد نەبێ
ژیان لای ئەو، غەم و ژانە
هەستی منیش، وەك ئەوانە
ڕووەو ئاوات، ڕائەوەستێ
بەگشت تواناو، سۆزو هەستێ
جاپەیمان بێ، خۆشەویستم
گەر هاتەڕێ، گشت مەبەستم
گەش و سەوز بێ، شاخ و کێوو
خەندە نەبڕێ، لە سەر لێوم
بەوێنەی بت، ئەت پەرستم
بە هۆش، بەگیـان، بە گشت ه

# لەچلەی جوانەمەرگی

# ▪ زمانی کوردی ▪

# غازی فاتح وەیسدا

عاصی فاتح وەیس

ڕۆژێك لە ڕۆژانی ساڵی «١٩٥١» لە دێیەك لە دێکانی دەشتی «گەرمیان» لە ئامێزی دایکی ئەکەوێتە خوارەوەو دەنگی گریان و واقەواقی بە بارەی مەڕو ماڵات و جریووەی پاساری و گارەگاری میرشك و باعە باعی بەرخۆلەی ساوا تێکەڵ دەبێ و ئەبێتە بەرهەمێکی تازەی دایك و باوکە هەمیشە کوڵنەدەرە کەی، کە لە ئازارو دەردو نەخۆشی ئەو سەردەمە ڕزگاری دەبێت، پێ ئەنێتە قوتابخانەو خوێندنی سەرەتایی هەر لەو دێیەدا تەواو ئەکات.

پاش ئەوەی هەست بەژیان ئەکات؛ بە دەوروبەری خۆیدا ئەڕوانێ کە پڕە لە کوێرەوەری و ناتەواوی لە هەموو بارێکی ژیانەوە، بۆیە هەمیشە بەڵێن ئەدا کە مل کەچ نەکات، چونکە بەراستی مرۆڤێکی کوڵ نەدەر بوو... خاوەنی بڕوایەکی پتەو بوو. کەوتە بەر بەرەکانیەکی درێژ خایەن لە گەڵ ئەو ڕۆژگارە سەخت و نالەبارەدا. هەموو ڕۆژێ بەیانیان ئەچوو بۆ «کفری» ئێواران ئەگەڕایەوە تاکو خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی تەواوکرد. ئەمەش بوو بە هاندەرێ کە زیاتر باوەڕی بەخۆی ببێت گورج بێتەوە بۆ قۆناغێکی تازەی ژیان لە گەڵ هەموو هەنگاوێکدا ئاوات و ئامانجی کەلێنەکانی دڵی پڕ دەکردەوەو زیاتر زاڵ دەبوو بەسەر کۆسپەکانی ڕێگای سەختی ژیاندا.

له ساڵی «١٩٧٠» له کۆلیجی ئادابی زانکۆی «بەغا» وەرگیرا توانی ئەو چوار ساڵه بـەسـەربـەرزی تـەواو بکـات بـە هـۆی مێشـك و بـازووه پۆلاینی یەکانی یەوه.

ساڵی «١٩٧٦» وەکو فەرمانبەرێك له کۆلیجی ئادابی زانکۆی «سلێمانی» جێگیر ئەبێت ئەو ماوەیه نیشانەی دلسۆزی و ئیش کردنی بوو. ساڵی «١٩٧٩» چـووه دەرەوەی ووڵات بۆ «انگلتـرا» بۆ خـوێندن تـاکو سـاڵی «١٩٨٠» پاش گەرانەوەی بۆ ووڵات که بڕوا نامەی «ماجستێر»ی وەرگرت له زانستی دەنگ دا به پلەیەکی باش، بوو به مامۆستا له کۆلیجی ئادابی زانکۆی «صلاح الدين» تاکو ساڵی پار بوو به سەرۆکی بەشی کوردی، هەتا ئەو ڕۆژه ڕەشەی ١٥/٩/١٩٨٥ که ڕۆژی یەكشەممه ئەکـات، کاتی کـه ئەهـات بۆ «سلێمـانی» بۆ بـەشداری له «ئاهەنگی یادی دووسەد و ساڵەیدا» مەرگی چەپـەڵ ڕێگەی لێگـرت و چڕنـوکی ژەهراوی گیر کرد له دڵه گەورەکەی و بردی بۆ جیهانه تایبەتی یەکەی خۆی.

ئەو دڵه پڕ له ئاوات و ئامانجەی له لێدان خست و کۆستێکی تری میللەته هەژار و چاره ڕەشەکەی کەوت. ئای مردن هەرچەنده گەورەترین هێزی سەر ئەم زەمینەی نەفرەتت لێبێت ژیانت لێ تاڵ کردین.

وا چل ڕۆژ زیاتر تێپەر بوو بەسەر کۆچی ناکاوی یەك جاریتا چل ڕۆژ پتره کـه گەلای سـەوزی تەمـەنت له به هـاری ژیانتـا ڕژایـه بـاوەشی زەویـه پـر شکۆمەندەکەی ووڵاتی بەفرو خوێنەوه. تاکوئێستاش دڵه کسپه لێ کەوتووەکەی ئێمەش وەکوو مەشخەڵی گەلانی چەوساوه هەر بڵێسەی دێت.

ئای برا دڵسـۆزەکەم چی بکـەین له دەست مردن و ڕۆژگـاری سەخت و مرۆڤی بێ ئابرووی ئەم سەردەمه چەتوونه، ئەشکه نجە و ئازار دەستی ڕەشی ناوەته بینه قاقای خەڵکه بێ دەرەتانـەکەوه. درك و داڵ و پـەیکوڵی زەهـراوی هەردەو بیابانەکان شالاو دەباته سەر گوڵی وەنەوشەو له خوێنی گەشیاندا نوقمی دەکـات. ئای چـەند بـورکانی قینت بـه ڕووی مرۆڤی نـاپـاك و پـوازەکـانـدا دەتەقیـەوەو بەقـەد پیتی ناو دوژمنه کـانت نەفرەتت لێ دەکردن.

برا خێر له خۆ نەدیوەکەم. دووا ووت و ووێژی نێوانمان له چوارەم ڕۆژی «جەژن»دا بوو. ئەوه بوو که دەتویست لەگەڵتان بێمەوه بۆ «سلێمـانی» بەلام داخەکەم ئەو شانازیەم پێ نەبڕا، هەزار داخ. ئیتر هەر ئەو بینینەوەیه بوو تا ئەو ڕۆژەی که دیوەنیم کردی له باوەشی شاخی باوه شاسواری سەرکەش دا. ئەم

شاخه بۆ گەشکە نەیگرێ کە میوانی وەکو «غازی» ڕازو نیازو نهێنی ئـەدەبو زمانی قەومی «ماد»و ئاوێستای بۆ بگێڕێتەوە.

کاتێ کە ویستت بیێ باسی دێرینی زمانە ڕەسەنەکەت بکەین کە چەند بڵندو سەربەرزە هەروەکو دار گوێـزەکانی هـەوارامانو کـانییە ڕوونـەکانی کوردستان پاکو خاوێنە بێ گەردە، وەکو خۆت ئەتووت «ڕەچاوی ئەم ڕێبازەمان کردووە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك دڵنیا بێت لەوەی کە زمانی کوردی نەك تەنیا لە ڕووی تیـۆرییەوە سـەر بەخـۆیە، بـەڵکو لە ڕووی چـەسپانـدنیشەوە هـەر سەربەخۆیەو ئەو زمانە نییە کە بەزارێکی لاوەکی زمانێکی تر دابنـرێ» دڵنیا بووی لەوەی کە هەر بەسەر بەرزی ئەمێنێتەوە، هەرچەندە تووشی ڕۆژگـاری سەختو نالەبار بێت.

بدا دڵسۆزەکەم هەموو کەس ئەو ڕۆژە پڕ شکۆیەی تۆی دەست ناکەوێت کە ئاوەها لە دڵە گەودەکەی نیشتماندا، شاری بەفرو خـوێندا بـلاوێنرێتـەوە، دەزانی ئێستا تۆ سەرتۆپی دوو سەرساڵەی شاری شارانی ؟ شاری هەڵەتو قوربانیو ئەشكو خەمو شیعرو شێخەکەی بەردەقارەمان.

برا جوانەمەرگەکەم.. سەری ماندوو لەپەنجەرەی مەزارە تاریکەکەتەوە دەربهێنەو بەخێر هاتنی میوانەکانت بکە ؟ بڕوا بکە هەموویان خۆیـان خاوەن پرسە بوون، لە ژێر دەوارە خەمناکەکەتا فرمێسکی گەرمیانو کوێستان تێکەڵ بوو. ئەو سامانی ڕێزو خۆشەویستییەی کە جێت هێشت لە نێوانمـاندا دڵنیای کردین کە تەنیا کوڕی ئێمە نەبوویت، بەڵکو کـوڕێکی بەوەفـای میللەتەکـەت، خاکەکەت، زمانەکەت، زانکۆکەت، قوتابییەکانت بوویت. ئەوەندەی پرسەکەرانت بەداخەوە بوون بۆت مەگەر باوکە جەرگ براوەکەت وا بێ. بەڕاستی خـاوەن پرسەو دڵ نەواییکەر هەر ئەوان بوون.

برای جوانەمەرگم.. بڕوا بکە مەرگە ناکاوەکەت جەرگی لەت لەت کردمو چۆکی پێ دادامەسەر زەوی بەلام !.. با گیانە پڕ جۆشو خرۆشەکەت لە گۆڕی تاریکدا ئۆقرە بگرێ ؟، با دڵە پڕ میهرو خۆشەویستەکەی نیشتمـان پەروەریت ئاسودە بێت ؟، با بچرپێنم بە گوێی خامە ڕەنگـینەکەتا کە کاروانی ووشەی پیرۆزی کوردی بە هەورازی ڕۆژگاری سەختو کوردا هەر هەڵدەزنێو ووشەو پیتی کوردی دەبێ ببێتە کەڵە پشکۆی کوانووی مێشکیو هەستی ئێمەی کورد.

ئای که میللەتێکی کڵۆڵ و تاساوی ژێر چەپۆکی رۆژگارێکی سەخت و نالەبارە، بەڵام دەبێت زاوەی مێشکی رۆشنبیرانی قەومی «ماد» توێشوویەکی چەوری هەموو رێبوارێکی شەکەتی رێ هات و نەهاتی سەرفرازیمان بێت.

لە کۆتاییدا جوانترین و پیرۆزترین دێرە شیعری پیرەمێردی نەمر.. دروشمەی دوا ووتەم بێت..

«پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن گرین
نامرن ئەوانەی وان لە دڵی میللەتا ئەژین»

---

تێبینی: ئەم ووتارە لە چلەی ماتەمینی جوانەمەرگ غازی فاتیح وەیسدا خوێندرایەوە کە زانگۆی سەلاحەدین (کۆلیجی ئەدەبیات) بەو بۆنەیەوە سازی کرد بوو.

لەم ژمارەیەدا — ل


| | | ل |
|---|---|---|
| ١ ـ سەروتار | نووسەری کورد | ٢ |
| ٢ ـ کوردستان لە تورکیا | د. ئەحمەد عوسمان | ٤ |
| ٣ ـ عەزەی سەید | حسین بەرزنجی | ١١ |
| ٤ ـ تۆری کوردێی | ریکێش ئامێدی | ١٦ |
| ٥ ـ عبد الله جەوهەرو.. | ئومێد ئاشنا | ٢٧ |
| ٦ ـ مامۆستا قەناتی کوردۆ.. | ممتاز حیدی | ٣٦ |
| ٧ ـ داش بەداش و.. | محمد علی قەرەداغی | ٤٥ |
| ٨ ـ هەوالدز | رەوف حەسەن | ٥٥ |
| ٩ ـ ڤان کوخ | محمد عمر عثمان | ٩٦ |
| ١٠ ـ ئازاری دەروون | محمد بەدری | ٩٩ |
| ١١ ـ کاتێ کە گڵ ئەبێتە.. | محمد ئەمین پێنجوینی | ١٠١ |
| ١٢ ـ موتوربە | سەباح رەنجدەر | ١٠٤ |
| ١٣ ـ لەیلان | صدیق خالد هروری | ١٠٧ |
| ١٤ ـ پێنج دەنگ | خالد حسین | ١٠٨ |
| ١٥ ـ شاعیرێکی رەنگ بۆرێژراو | حسیب قەرەداخی | ١٠٩ |
| ١٦ ـ ماڵ ئاوایی | سیامەند محمد | ١١١ |
| ١٧ ـ پارچە شیعرێکی بڵاونەکراوەی لوتفی | محمد زەهاوی | ١١٢ |
| ١٨ ـ هەڵوێست | عبد الخالق سەرسام | ١١٤ |
| ١٩ ـ کۆچ وگەڕانەوە | جمعە رجب شوانی | ١١٥ |
| ٢٠ ـ شیعر بۆ هەمووان | و: شێرزاد عبد الرحمن | ١١٦ |
| ٢١ ـ ئەی نازدار | فاضل قصاب | ١١٧ |
| ٢٢ ـ شنەی هیوا | مەهاباد قەرەداغی | ١١٩ |
| ٢٣ ـ شیعرێك وشاعیرێك | حسین احمد جاف | ١٢١ |
| ٢٤ ـ ژڤەرێژا جەنگا مەزن | سەبری بوتانی | ١٢٤ |
| ٢٥ ـ من و.. تۆ | احلام منصور | ١٣٦ |
| ٢٦ ـ گرێی دەروونی | زیاد پیربال قصاب | ١٤٣ |
| ٢٧ ـ نامۆ | دانا علی سعید | ١٤٩ |
| ٢٨ ـ بەدامێنی شاخێکەوە | احمد سید علی بەرزنجی | ١٥٤ |
| ٢٩ ـ شەڤۆ | نور الدین انور بوتانی | ١٥٩ |
| ٣٠ ـ مالین ماککوکین | و: ئازاد بەرزنجی | ١٦٣ |
| ٣١ ـ بەراوردێکی ویژەیی | شاکر فتاح | ١٧٠ |
| ٣٢ ـ برسیەتی | و: ئەسعەد عەدۆ | ١٩٠ |
| ٣٣ ـ بازنەی رۆژانی هەینی | هاشم ئەحمەد سەراج | ١٩٦ |
| ٣٤ ـ خۆزگە خوازی | عثمان حمد | ٢٠٠ |
| ٣٥ ـ بۆتۆ ئەگریم | عبد الله صالح شارباژێری | ٢٠٢ |
| ٣٦ ـ لەچلەی ـ غازی فاتح وەیس ـ دا | عامر فاتح وەیس | ٢٠٤ |